# خۆشەویستیت کۆتـایی نـایە

## خالیدئەشکەنەیی





ناوی کتێب :خۆشەویستیت کۆتایی نایە

بابەت: شیعر

نوسەر:خالیدئەشکەنەیی

تایپ:(سۆزان محمد)

دیزاینی بەرگ:............

چاپ:چاپەمەنی بابان

تیراژ:1000 دانە

چاپی یەکەم_2007







(پێشەکی)

شیعر بەرلەوەی زۆرجار هەڵچونێکی سۆزداری بێت درکاندنی پەیامێکە بەزمانێک کە لەسەروی زمانی ئاسایی خۆمانەوەیە, نوسینەوەی شکستێکە لەو شکستانەی مرۆڤ شانازی پێوەدەکات پێچەوانەی هەموو شکستەکانمان دەمانەوێت لەیادمان بێت دەمانەوێت ئاشکرای بکەین...

شیعر ڕاستگۆترین وێنەی دڵی مرۆڤە وەلێ ئەم وێنەیە پارچە پارچە دەکرێت بۆیە تۆ دەبێت وا هەست بکەی پارچەکانی دڵی مرۆڤێک دەخوێنیتەوە .

شیعر دایکی گۆرانیە بەلاّم ئەم دایک و کۆرپە لەیەکتر جیاوازن چونکە ئێمە دەتوانین لە زۆر کات و شوێن گوێ لەگۆرانی بگرین بەلاّم خوێندنەوەی شیعر پێویستی بەکات وشوێنی زۆر تایبەتی هەیە جوانترین شیعر لەکات و شوێنی نەگونجاودا مانای خۆی لە دەست دەدات بۆیە کاتێک مافی بڕیاردان لەسەر شیعرێک دەدەم بەتۆ کەمافی شیعرەکە بدەیت لەڕوانگەی کات و شوێنەوە.





ئەم کتێبە زادەی واقیعێکە کە خەیاڵ لەباوەشی گرتووە ئاراستەکردنێکی تایبەتی یە بەلاّم تیرِوانینی واقیعیانە بۆئەم شیعرانە ڕەنگە گونجاو نەبێت بۆیە تۆ بەدڵ وهەستێکی ناسک بی‌یان خوێنەوە نەک بەبیرێکی تیژبۆئەوەی بەیەک بگەین چونکە ئەم شیعرانە زادەی جیهانە فەنتازیاییەکەی دڵ و هەستن بەهەستێکی ڕوونی ئاوی‌نوسیومن پێم وایەبوارێکم بۆ پرسیارکردن نەهێشتۆتەوە .

لەگەڵ ئەو پەڕی ڕێزو خۆشەویستیم بۆ تۆ هیوادارم ئەو ساتەی لەڕێگەی ئەم کتێبەوە لەگەڵتام خۆشەویستیەک بەرانبەر یەکتر دروست بکەین چونکە تەنها خۆشەویستی‌یە مانا ئەدات بەهەموو شتێک.

خالیدئەشکەنەیی

2007/3/9

پێشکەشەبە چنە..........





## ( ژیان سزایە )

بیر لە ئازاردانم مەکەوە

ڕەنگە من ئەوەندەم بەس بێ

کە لەدوای تـۆ

دڵم وێڵ و بێکەس بێ

من ئەوەندەم بەسە

کە ڕۆژگارێک ببینم

بێ چاوی گەشی تۆ

بڕوا عومری شیرینم

بیر لەزیاتر مەکەوە

کوابەرگەی ئەوەندەش دەگرم

بەچاوی تۆ ڕۆژێ دێ

بێشک لەتاوی تۆ دەمرم







قەت تۆم بیر ناچێتەوە

سوێندبەوعەشقەی لەدڵمایە

دواى تۆ ژیان بۆ من

گەورەترین سزایە.

**( مەڵێ وازبێنە )**

گەر رۆژێ

منت بینی

لە ڕوخسارم

دەرڕژا غەمگینی

بزانە دواى تۆ

هەناسەیەک نەماوە

خۆشی ببەخشێ

بەم دڵە شکاوە

خۆشەویستم ئەزانم

رۆژێ لە تاوت شێت دەبم

توخوا مەڵێ وازبێنە

تا مردن چاوەڕێت دەبم.





**( خۆشەویستیت بێ سنورە)**

بەجۆرێک خۆشم ئەوێی

ئاوێتە بووى بەدڵ و خوێنم

گەر رۆژێ بمەوێ دەرت کەم

دەبێ ئەوانیش دەربێنم

چاوم خووى بە تۆوە گرتووە

بوویتە تروسکایی ژینم

بڕوابکە حەزناکەم

لەتۆ زیاتر ببینم

دەڵێن هەموو شتێ سنورى هەیە

سنوری خۆشەویستی من و تۆ کوا

داگیرت کردووە ئەو بەشەی دڵیشم

دامنا بوو بۆ خۆشەویستی خوا

**( ئەوە دڵمە )**

نە ئەتوانم خۆشم نەوێ

نەدەتوانم رقم لێت بێ

چاوەکانیشم دەربێنی

ناچارم ئومێدم پێت بێ

ئەوە من نیم خۆشم دەوێ

هێندە پەیوەستم پێتەوە

بەڵکو دڵمە لە چرکەیەکا

سەدان جار تۆی بیردێتەوە.



خۆشەویستیت کۆتایی نایە ................ خالید ئەشکەنەیی

**( هەناسە )**

ئەی فریشتە

هەرچەندە خەمەکانت

بە لێشاو یەخەیان گرتوم

هەرچەندە خۆشەویستیت

لە ڕیشەوە وشکی کردووم

هەرچەندە لەسەر دڵم

بوویتە ناسۆرترین برین

هەرچەندە چاوەکانمت

کردۆتە کانگای ئەسرین

بەڵام چی بکەم

عەشقت بۆتە هەناسە و خوێنم

بۆتە ڕوحم

دەرچێ منیش نامێنم.

## هەستێک

خۆشم ئەوێ

هێندەی ئەو فرمێسکەی لە چاوم دێت و

بەسەر ڕوومەتما دێتە خوارێ

خۆشم ئەوێ

وەک هەر خەمێ وەک هەر ئازارێ

خۆشم ئەوێ

هێندەی خەیاڵ

هێندەی بادەیەکی تفت و تاڵ





خۆشم ئەوێ

هێندەی تەنیایی

هێندەی عەشقێکی پاکی خوایی

خۆشم ئەوێ

هێندەی ئەو شیعرەی بۆتی ئەنوسم

هێندەی تەمەن و ژیان و چارەنوسم

خۆشم دەوێ

زیاتر لە هەموو شتێک

زیاتر لە خۆشەویستی

کورێک بۆ کچێک.

## خەیاڵ

شەوانە کە خەیاڵت

دڵی پڕ سۆزم پڕ دەکا

کە مۆتەکەی یادت دەمگرێ و

حاڵم شر دەکا

هیچ شک نابەم

سوێی ئەم ئازەرەمی پێ بشکێنم

جگە لەوەی خەمەکانت

بکەمە هۆنراوە و

لەناو دەفتەرەکەما بیانخەوێنم.

**( پەیام )**

تادێ تۆم خۆشتردەوێ

تادێ لە دڵما سەوز دەبی

وەکو درەخت باڵا دەکەی

تادێ زیاتر بەرز دەبی





بۆیە دەترسم

لێرە بە دوا

هەرنەتوانم بتگەمێ

ئەو پەیامەی لە دڵمایە

فریانەکەوم بت دەمێ.

**( ئازار )**

هەموو شەوێ

لەگەڵ تاریکیدا بیرت دەکەم

لەگەڵ تیشکی ئەستێرەو

نیگای مانگدا بیرت دەکەم

هەموو کات و ساتێ

لەگەڵ پشکوتنی هەموو سپێدەیێ

لەگەڵ وەرینی خۆر و

داباریني هەموو زەردەپەڕیٚ بیرت دەکەم

لەگەڵ هەموو ئەوانەدا

ئیتر تۆ دەبیتە فرمێسک و

لە چاوانما خۆت دەردەخەی

تۆ دەبیتە هەناسەیەکی پر لە ئاخ و

لە گەروما کلّپە دەدەی

دەبیتە ئازارێک

بەناو دەمارەکانی خوێنما دێیت و دەچی

تیٚر تیٚر ئازارم پیٚ دەدەی

تا لیٚم وەڕەس دەبی

نا ببورە هەرگیز ژانی تۆ لیٚم وەڕەس نابیٚ

ئازاری تۆ بۆ چرکەیەکیش منی بیر ناچیٚ

خۆزگە دەمزانی ئەم هەموو ئازارە

لە تاوانی چیدا دەچیٚژم

ئەو هەموو فرمیٚسکە گەشانەم

لەپای چی و بۆچی دەریٚژم

زۆرجار دەڵیٚم

خۆزگە خۆشم نەدەویستی





خۆزگە رەنگم نەئەدی و

دەنگم نەدەبیستی

ئەی کچی وولاٚتی گومان

ئەی شیرینتر لە خەوی دوای ڕژان

دەپیٚم بلٚیٚ ئەم هەموو حەزەم لە تۆ

لە چیەوە سەرچاوەی گرتووە؟

سەرەتای ئەم شیٚتیەم

لە کوێوە دەستی پیٚکردووە؟

حەزت بۆتە کانیەک

هیٚدی هیٚدی

لە دلٚما هەلٚدەقولٚیٚ

تا دیٚ زیاتر عاشقت دەبم

زیاتر دەروونم

بۆت دەکولٚیٚ

ئەی هیٚمنتر لە تەنیایی

ئەی جوانتر لە هەموو جوانیەکی خوایی

دەوەرە

تاویٚ سەرنجم لیٚ بدە

گویٚ رادیٚرە بۆم

تۆزیٚ لە ئازارەکانم تیٚ بگە

ئەوە دنیایە نەبادا تۆش

ڕۆژێ توشی ئازار بی

نەبادا تۆش

ڕۆژێ بە داخی عەشقێکەوە گرفتار بی

وەرە تێبگە لە ئازار بزانە چۆنە

ساتێ لە حاڵی من بڕوانە چۆنە

وەرە من لە تۆوە فێری خۆشەویستی بووم

تۆش لە منەوە فێری ئازار بە

وەرە تاوێ گوێم بۆ رادێرە

لە ساتێکی ژیانم ئاگادار بە

تا کە ڕۆژێ مردم

بابزانی چی بوو منی کوشت

تابزانی چی بوو

خوێنی حەزی منی ڕشت

ئەی ناسکتر لە دڵی من دەپێم بڵێ

بەو ناسکیەوە چۆن دەتوانی

بەرگەی ئەم هەموو تەنیایی یە بگری

وەرە جارێ

نەکا لە تەنیاییدا هەڵوەری بمری

زۆر دەترسم





زۆر دەترسم فریا نەکەوین

چونکە لەم وولاتە

بۆ دابڕان لە بەهانەیە ئەوین

ئەی کچی ڕەنگ گەڵاڕێزان

وا من خەریکە خۆشەویستی

بە خۆر دەبەخشم

تا بەیانیان تیشکەکانی

لە دەروازەی پەنجەرەکەتەوە

خۆشەویستی منت پێ بگەیەنن

وا من حاڵی خۆم بۆ ئەستێرەکان باس دەکەم

تا شەوانە کە دابارینە سەرماڵەکەتان

لە جێی من

حاڵی منت پێ بگەێنن

بڕوا بکە هەرچەندە بیر دەکەمەوە

هەرچەندە دەپرسم و دەخوێنمەوە

هەتا ئێستا

نەم توانیوە شتێ بدۆزمەوە

خۆشەویستی خۆمی

بۆ تۆ پێ مەزەندەکەم

بروا بکە نازانم

نازانم بڵێم بە قەد چی

خۆشم دەوێ و

حەزت لێ ئەکەم

خۆشم سەرم سورماوە لەو دڵەم

چۆن دەتوانێ هێندەی خۆش بوێ

هێندە ئازاری دەدەی کەچی زیاتر

حەز دەکا لەناویا بروێ

ئەی کچی جوان بەس دڵم بگوشە

بەس بم کە هاورێی جگەرە و شوشە

بەسە ئیتر لەم تەمەنە پڕ ژانەما

دەرم بێنە لە ژێر باری خەم

خۆ من لە جێی خوێن و هەناسەش

تەنها و تەنها تۆ شک دەبەم

بەسە ئیتر وەرە جارێ

ئەم دووریە بکوژە بە دیدارێ

وەرە تەنها

ساتێ لێم حاڵی بە

تۆش لەگەڵما





هاودەمی تاڵی بە

نابمبورە

کە تۆبێی تاڵی تیانامێنێ ژین

خەمیش لەلام دەبێتە

شتێکی وەک تۆ شیرین

هەموو شەوێ

کاتێ بیرت دەکەم و دڵم پر دەبێ

کاتێ لەناو بەفری خەما روحم سڕ دەبێ

ئیتر بۆ سەبووریم

لە جێی تۆ شیعر دەکەم بە هاودەم

تیای هەڵدەرێژم رازی دڵی پڕخەم

بۆیە ئێستا وا هەست دەکەم

کە خوا جگەلە تۆ و خەم

پێی بەخشیوم شتێکی تر

ئەویش شیعرە شیعر

کەوا دەڵێم تورە مەبە

مەبەستم ئەوە نیە شەریکت بۆ پەیدا بکەم

یا خوا نەخواستە شتێکی تر هەبێ

لە جێی تۆ دڵی پێ بدەم

هەرگیز ئەو هەڵەیە ناکەم

خۆ دڵیشم لێم قبوڵ ناکا

بروا بکە دڵم

تاڵێکی پرچت بە دنیا نادا

بەلاّم بۆیە شیعرم هێندە خۆش دەوێ

چونکە هەردەم لەگەڵ خەمی تۆدا دەردەکەوێ

خوا نەکا گەرجارێ شیعرێکم نوسیبێ

لە باسی تۆ بێ بەریبێ

ئەوا یا ئاگام لە خۆم نەبووە

یا خەمێ منی مەست کردووە

بەلاّم یەک جیاوازی

لەنێوان تۆ و شیعر هەیە

حەزیش ناکەم دەری برم

بەلاّم بمبورە

ناتوانم نەیڵێم

چونکە گیانە زۆر دڵپرم

شیعر وەک تۆنیە

لەوەتەی ناسیومی قەت جێی نەهێشتوم

هەرگیز نەی گریاندووم و

خەم و ئازاری پێ نەچێشتوم

بمبورە کە شیعری ئەمشەوم بۆنی گلەیی لێ بێ





کە دیاری ئەم جارە بۆ تۆ کەمێ خەمی پێ بێ

خۆ دەزانم بەیانی لەم دێرانەم پەشیمانم

بەلاّم دڵم نایە بی یان درێنم

چونکە شیعریش وەک تۆ

تێکەڵ بووە بە هەناسەی ژیانم

گرنگ نیە هەرچی دەڵێم

تکا دەکەم لێم ببوری

چونکە شەوانە زۆر بێزارم دەکا

خەمی نەگریسی دووری

گەر ئەمشەو لە مەنهەج لامدا بێ

رەنگە خەمێک بێ بە بامدا بێ

ئەگینا تا خەمم پێ بدەی

بروا بکە لام خۆشەویستتر دەبی

هەتا ئازارم پێ بدەی

شیرینتر دەبی زیاتر بە دڵما دەچی.

16

## ( هەڵبەست )

کە بەناوی تۆ

دەست دەکەم

بە نوسینی هەڵبەستێ

دەڵێی فرمێسکی چاومە

بە هیچ شتێ بۆم ناوەستێ

بۆیە لە نوسینا

زۆر جار درێژ برم

حەز دەکەم ووشەیێ زیاتر

هەستی خۆمت بۆ دەربرم

تا تێبگەی

منیش ئەندامێکی جەستەی تۆم

تا تێبگەی بەڕاستی

تۆم خۆشتر دەوێ لە خۆم.

## ( سەرنج )

لەگەڵ پشکوتنی هەموو سپێدەیەک

تۆش دەبیتە گوڵێک و





لەناو ئینجانەی خەیاڵمدا دەپشکویت

لەگەڵ وەنەوزی شەوانمدا

تۆش دەبیتە نیگایێکی خەو شیرین

لەناو پێڵوی چاوەکانمدا دەنویت

بۆیە ماوەیەکە هەست دەکەم

خەیاڵ و بیرکردنەوەم تەواو گۆڕاوە

خەڵکیش زۆر سەرنج لە چاوەکانم دەدەن

دەترسم هەستیان کردبێ

تۆم لەناویانا حەشار داوە.

## ( زیزبوون )

کاتێ لە یەکتر زیز دەبین

هەر لە گەڵاْ و درەختی پاییز دەچین

من وەک گەڵاْ

رەشەبای خەم بێرو بەویێم دا ئەدا

تۆش دەبیتە درەختێکی ڕووتەڵ ْ و

بیْ دەنگی ووشکت دەکا

هەردوکمان بیْ ناز دەبین

هەتا ئەو رۆژە دێتەوە

کە دڵت هەستی دەبزویْ و

لەگەڵم ئاشت دەبێتەوە.

**( ئیلهام )**

شەو درەنگە





بادەی شیعرێک مەستی کردووم

ئیلهامێک وا لە هەستمدا

یەخەی گرتووم

دەزانم دڵم دەیەویْ

ئەمشەویش دەرگای شیعریْ بشکێنیْ

قەڵەمەکەم نایەتە نوسین

خەمی ئەمشەوم بنەخشێنیْ

دەزانم هەوێنی

شیعری ئەمشەویش هەر تۆی

ئیتر بۆ نایێی دروستی کەی

بۆ وا لەسەر خۆی؟

**( خۆشەویستیت دەمکوژیْ )**

تەمەنێکە بۆت دەسوتێم

پێم سەیرە کە گڕ ناگرم

زەمەنێکە خەمت دەخۆم

بەم هەموو خەمە من بۆ نامرم؟

تۆ فریشتەی خەمی

یا ئەستێرەی بەختی منی

هەردەم خەیاڵم پڕە لە تۆ

کەچی هەمیشە لێم وونی

بەم هەموو ناسکیەتەوە

چۆن دەتوانی هێندە ڕەق بی

زۆر جار گومان دەکەم لێت

باوەر ناکەم لەسەر هەق بی

زۆر زۆر ئازارم پێ ئەدەی

حەز ناکەم بیدرکێنم

حەز دەکەم سەدان جار بشکێنم

بەڵام جارێک دڵت نەشکێنم





تۆ کانگای ئازاری منی

کەچی هەر خۆشەویستر دەبی

خەمەکانیش وەک خۆت شیرینن

بۆیە تادێ بە دڵما دەچی

تادێ زیاتر دەبی بە پێویستی

بۆ خوێن و روح و دڵم

بۆیە گە ر بێ تۆ بم

وا هەست دەکەم مشتێ گڵم

هەناسەیەکی پڕ لە سوێی

بەناو روحما دێیت و دەچی

کاتێ دەمەوێ بتگرم

وەک سیحر لێم وون دەبی

تۆ لەناو وولاتی دڵما

تاجی پاشایەتیت لەسەر ناوە

هەتا ئێستا سەدان جار

روحی منت لە خاچ داوە

زۆر جار بە دڵم دەڵێم
با تو خوا بیکەینە دەریێ
روحم ناتوانیێ چیتر
ژیانی لەگەڵدا بباتە سەریێ
کەچی دەڵیێ
چۆن دڵی ئەو دەشکێنی
گەر ویستت ئەو دەربکەوی
بیرت نەچێت منیش دەربێنی
جاروبار کە شێت دەبم
حەز دەکەم لە دڵم دەرت کەم
حەز دەکەم توشی
ئاخ وداخ و کەسەرت کەم
بەڵام کە هۆشم دێتەوە
زۆر چاک لێت تیێ دەگەم
تۆ شتێک نیت من بتوانم
لەناو دڵما دەرت کەم





تۆش وەک روح و هەناسەم
بەشێکیت لە من
ئەوان لەچاو تۆ
هەر زۆر زۆر کەمن
هەر چەند ئەوان
بۆ ژیان زۆر پێویستن
بەڵام درۆ دەکەم گەر بڵێم
هێندەی تۆ خۆشەویستن
هیچ شتیێ لەم دنیایەدا
هێندەی تۆ خۆشەویست نیە
گەر ژیانم تۆی تیا نەبیێ
بیێ مانایە مانای چی یە؟
بۆیە ئێستا
هیچ گومانت لیێ ناکەم
بە خۆشەویستیتەوە دەمرم
گەر بشزانم پێت ناگەم

تۆ نازانی چیم لێ دەکەی

تۆ نازانی چیم پێ دەکەی

لەم تەمەنە پڕ ئازارەما

تۆ چەندە ئازارم پێ دەدەی

زۆر جار بێزار دەبم

لە خۆشەویستیت دەتۆرێم

هەست دەکەم رۆژ بە رۆژ

تێک دەشکێم و دەدۆڕێم

هەست دەکەم هێدی هێدی

خەریکە خەم دەمخواتەوە

خۆشەویستی دڵی شۆخێک

تەمەنم لێ دەباتەوە

لە پانتایی حەزی خۆیدا

ووردە ووردە یاریم پێ دەکا





خەزانێکە گەڵای سەوزی

عومری لاویم بەربا دەدا

بەفری هیوا و ئاواتم

داواتە بەر خۆری چاوی

خەیاڵم بۆتە پێنج پارچە

لە خۆشەویستی پێنج پیتی ناوی

پرشنگی خۆری نیگای

خەریکە دەمتوێنێتەوە

زریانێکە زۆر دەترسم

مۆمی تەمەنم بکوژێنێتەوە

لەگەڵ هەموو ئەوانەشا

وەک پێویستیم بە هەناسەیە

پێویستیشم بە خەم و ئازاری

ئەو شۆخە ناسکەیە

ئەوەی منی کوشتوە

لێوان لێوە لە مناڵی

لە شەکر شیرینترە

کەچی بۆ من پرە لە تاڵی







ڕەنگە نەتوانم تاسەر

بەرگەی خەمی ئەو بگرم

بەڵام هەر بەختەوەرم

بە خۆشەویستی ئەووەوە بمرم.

## ( بارقمان لێك بێ )

هەرچەندە بیر دەکەمەوە

لە یاسای ژین

باوەر ناکەم

من وتۆ بۆیەک بین

چەند داستان و

رۆمان و چیرۆکم خوێندۆتەوە

لای چەند قاوەگرەوە

بەختم گرتۆتەوە

پێم دەڵێن

هەر دوا نەیێ یەکتریان پەرستبێ

بۆیەک نابن

چەنێ یەکتریان خۆشەویستبێ

منیش دڵنیام





پەیوەندی من وتۆ گەیشتۆتە پەرستن

دەمێکە دەرچووە

لە عاشق بوون و خۆشویستن

بۆیە گوڵم خەمێک دای گرتووم

دەترسم بۆیەک نەبین

ڕۆژێ لەم دنیایەدا

پێکەوە نەژین

دەترسم ئەم هەموو خۆشەویستیە

سەرمان بخوا

ئەم هەموو یەکتر پەرستیە

بە فیرۆ بڕوا

بۆیە دەڵێم با خۆشەویستیمان

ئاسایی وەک هەر کوڕ و کچێک بێ

با جار جارە شەر کەین و

کەمیٚ رقمان لیٚک بیٚ.

**( فرمیٚسك )**

فرمیٚسک نەما چاوم ماچ نەکا

خەم نەما هەواڵم نەپرسیٚ

شەویٚ نەبوو دڵی شیٚتم

بۆ تەنیایم دانەگیرسیٚ

چرکەیەکی تەمەن شک نابەم

بە خەیاڵ مەستت نەکردبم

کاتیٚ گومان لە خۆشەویستیم کە

کە بیستبت من مردبم

رەنگە روحیشم هیٚندەی تۆ

شیرین و خۆشەویست نەبیٚ





رەنگە هەناسەشم بەقەد تۆ

بۆ گیانم پیٚویست نەبیٚ

بۆیە بروا بکە ئەگەر

دڵم لەناو خۆشەویستیتا بتویٚتەوە

بەڵاٚم هەرگیز بروا نەکەی

رۆژیٚ بیٚ تۆی بیرچیٚتەوە.

**( دڵرەق )**

لە بەرانبەر دڵ رەقیت

لە بەرانبەر بیٚ هەستیتدا

لە بەرانبەر بەرەزە فڕی و خۆپەرستیتدا

تەنها و تەنها وولاٚمی من بۆت

شیعریٚکی ناسکە وەک خۆت

جگەلە شیعر زمانیٚکی تر نازانم

پیٚی بدویٚم پیٚی بڕوانم

هەموو گیانت پڕ کردوم لە خۆشەویستی

ئیتر چۆن ڕقم لیٚت بیٚتەوە

ئەو ساتانەش گلەیت لێ دەکەم

لە هەموو کات زیاتر دڵم پێتەوە.

( **هۆنراوە** )

زۆر جار کە لێت توڕە دەبم

دەڵێم ئیتر شیعرت بۆ ناڵێم

چیتر دوات ناکەوم و

وەکو سایە بە دواتا نایێم

بەڵام ئەی فریشتە

خۆشەویستیت بەجۆرێ تێم ئاڵاوە

توڕە بونیشم لە تۆ

بۆ خۆی دەبێ بە هۆنراوە.





( **نائومێدی** )

کە نائومێد دەبم لێت

ژیان لەلام مانایەکی نامێنێ

کە ڕەشبین دەبم لێت

گەشبینی لە ژیانما هەرەس دێنێ

هەموو شتێک لە تۆدا دەبینم

ژیانم بە تۆوە بەندە

لە دەستت دێ بم گرێنی

یا شاگەشکەم کەی بە خەندە

زۆر وابەستەم پێتەوە

بەیەکجاری داگیرت کردووم

خۆشەویستیت بە جۆرێکە

تەواوی بیرکردنەوەی بردووم

زۆر بیرت لێ دەکەمەوە

زۆر بە دڵ خەمت بۆ دەخۆم

هەمیشە دەڵێی مەستم

بە خەیاڵ بۆ لات دەرۆم

کاتێ زنجیرەی خەیاڵم

بەرەو تۆ دەکەوێتە ڕێگا





وشکم دەکا مەستم دەکا

ڕەق دەبم لەناو جێگا

زۆر دەترسم

ئەو کەسەی تواومەوە لەناویدا

بموەرێنی

لە تەمەنی سەوزی لاویدا

لە چاوانت دڵنیام

بەڵام لە دەریای دڵت دەترسم

چونکە بوارنادا

هەواڵی خۆشەویستی لێ بپرسم

خۆ زۆر بیرت لێ دەکەمەوە

بەڵام چۆن لە بێ دەنگی بگەم

بڵێم چی کە نەتوانم

بێ دەنگی تەفسیری بکەم

خۆزگە خۆشەویستی

لە نێونیگای چاوا دەرنەچووبا

تاوەک ئێستا خۆم

لەناو دڵێکا لێ وون نەبووبا

خۆزگە دەمزانی

لەم هەموو بێ دەنگی چیت دەست دەکەوێ

چۆن دەتوانی ئازارم دەی

کە من هێندەم تۆ خۆش دەوێ ؟

## ( دڵ )

کە لە دڵ و هەناسەم

خۆشەویستی تۆ بباری

بۆچی ناشێ لە دڵما

سەوزبیت وەک بەهاری

کەمن هەمیشە دەروێش و

عاشقی سەودا سەرت بم

بۆچی ناشێ





لە گەشتی ژیان هاوسەفەرت بم

کە چاوم پاوانی تۆ بێ و

کەسی تری پێ نەبینم

بۆچی ناشێ تۆببیتە

ئاسمان و ئەستێرەی ژینم

کە ئامادەبم تا مردن

چاوەرێی ووشەیێکت لێ بکەم

بۆچی ناتەوێ

لێم تێبگەیی و لێت تێبگەم

کە دەزانی

تۆ پەرستی وەک من کەمن

بۆچی ناشێ ئەو دڵەت

وەک دیاری ببەخشی بە من.

## ( فریشتە )

کە جلە سپیەکانت دەپۆشیت

نازانم بڵێم لە چی دەچیت

دەڵێن فریشتەش سپی یە

بەڵام بە خوا تۆ شیرینتریت

یاوەکو کلوە بەفر

لەسەر پێڵوی چاوم دەنیشیت

بەشەرمەوە تێم دەڕوانی و

بەرامبەرم دادەنیشیت

بەڵێ هەروەکو کلوە بەفر

زوو دەتوێیتەوە و وون دەبیت

لەسەر برژانگم دەبیتە ئاو و

وەک فرمێسک لە چاوم دەردەچیت

ئاخ فرمێسک

دەتو خوا هەر بەفربە

ڕازیم

هەر خەریکی ناز و مەکر بە

بەس هێندە زوو زوو جێم مەهێڵە

ئەو دڵەم هیچی تیا سەوز نابێ

ئیتر بێ هودە مەیکێڵە.

( **گلێنەم** )

بۆچی دڵی نەرمت

دەکەی بە بەرد و ئاسن لە من

بۆچی ئەو چاوە گەشانەت

لە ئاستی من وا پڕ خەمن





کام خەیاڵ مەستی کردوی

لە روحی منا بەدی ناکەی

دوای چی کەوتوی

وا دەزانی لەگەڵ منا پێی ناگەی

وەرە تاتۆوی ئەندێشەکانت

لە ناخی دڵما بچێنم

خۆشەویستیت وەک فرمێسک

لە گلێنەی چاوما بڕوێنم.

( **کلوەبەفر** )

کە ڕووی تۆ

لە کلوە بەفر چێت

چاویشت

وەک تیشکی خۆر بێت

کە ئەم دوانە

لە یەک بدەن

دەبێ

چ جوانیەک دروست بکەن

ئیتر بە قوربان

چۆن بتوانم

کە بینیمیت

لێت نەڕوانم.

**( نامەیەکی کراوە بەرلەوەی بتناسم )**

زۆر بیرت لێ دەکەمەوە

سەرنج لە هەموو شتێکت دەدەم

تەنانەت زۆر جار بە خەیاڵ

درک بەخەیاڵەکانیشت دەکەم





زۆر وابەستە بووم پێتەوە

هەمیشە ئاکارەکانت دەخوێنمەوە

سەرنج دەدەم لە رۆیشتنت

لە دانیشتن لە گفتوگۆت

لە جوڵەی دەستەکانت

لە نیگای نەرم و لەسەرخۆت

دەبێ هەستی پێ بکەی ؟

نازانم زۆر جار دەمەوێ

هەست بەوە بکەی

کە تۆم خۆش دەوێ

زۆر شەرمنی

هەمیشە سەردائەخەی

هەندێ جار نەبێ

کورتە نیگا ئەکەی

نیگاکانت زۆر کورتن زۆر

حەزدەکەم شەڕکەن خۆر

لەوە دەچێ

زۆر جدی بی لەگەڵ دەرسەکانت

بۆیە زۆر کەم دەتبینم

لەگەڵ هاورێ کچەکانت

زۆرجار بۆ پشودان







دێیتە ژێر دارەکەی

قەراغ باخچەکە

دائەنیشی یا رادەوەستی

لەگەڵ سێبەری دارەکە راهاتوی

هەمیشە ژوانی لەگەڵا دەبەستی

کە بەو ناوەدا تێ دەپەرم

جار جار دەتبینم لەوێ

وا هەست دەکەم

لەگەڵ ئەو دارە

زۆر یەکترتان خۆش دەوێ

لەوێ لەژێر چاوەوە

نەرم نەرم نیگا دەکەی

لێم دەڕوانی

زۆر دەترسم

بە ڕازی دڵم بزانی

خۆ حەزیش دەکەم

لێم تێبگەی

هەناسەیەکی خۆشەویستی

بەم دڵە گرفتارەم بدەی

بەڵام زۆر شەرمت لێ دەکەم زۆر





بە خوا شەرمت لێ دەبارێ

ئەگینا هەموو شەوێ

بە خوڕ فرمێسک

بۆ تۆ لە چاوم دێتە خوارێ

زۆر بەغیلیم بەو دارە دێ

کە تۆ لەژێریا دادەنیشی

هۆگری ئەو وای لێکردوی

بە کەسی ترەوە نەنیشی

خۆ بە تۆوە ئەو دارەشم خۆشئەوێ

سەبوریم بەودێ

کاتێ تۆ نەبی لەوێ

کە لەوێ دەتبینم

بەو ناوەدا دەخولێمەوە

تاسیلەی نیگاێکم تێدەگری

شێت دەبم دەتوێمەوە

کاتێ گەڵای دارەکە

بەسەر پرچت دا بەردەبنەوە

زۆر رقم لێ دەبنەوە

تۆش یەک یەک فرێیان دەدەی

هەست دەکەم ناتەوێ توڕەیان بکەی

هەر کە تۆ ئەوێ جێدێڵی

من دەچم لەو دارە دەفکرم

ئەو گەڵایانەی زەردن دەیانچنم

نەکا کە تۆ هاتیتەوە

بەسەرتا بوەرن و بێزاربیتەوە

ئەو کاغەزانەش

کە لەژێر خۆت ڕایان دەخەی

هەموویان کۆدەکەمەوە دەیانخوێنمەوە

تێیان دەفکرم دەڵێی هیچم نەدیوە

دەناخۆ دەزانم ئەو کاغەزانەت

لەو دەفتەرە کردۆتەوە کە مسۆدەت تیا نوسیوە

بەلآم هەر شیرینن هەر جوانن لام

چونکە بەخەتی تۆ نوسراوە

بەلآم خەتەکەت زۆر کاڵە دەڵێی هەمیشە

قەڵەمەکەت مەرەکەبی لێبڕاوە

رۆژێکیان وەرەقەی تاقی کردنەوەکەت

بۆ خۆت ڕاخست

کە چووم هەڵم گرتەوە





سەرم داخست

چونکە لەم تاقیکردنەوەوە

دەرنەچوو بوی

بۆیە ئەو رۆژە بینیمیت

زۆر بێ ڕوو بوی

چاوەکانت پڕ بوون لە ئاو

خەریک بوو فرمێسکیان لێ بتکێ

بۆیە ئەو رۆژە زۆر دوعام کرد

دەستی مامۆستاکەت بشکێ

ئێستاش ئەو وەرەقەیەم

هەر لەلا ماوە

بەلآم نمرەکەی مامۆستام سڕیوەتەوە

بیست لە بیستم بۆت داناوە

بە دەست خۆم نییە

هێندەم خۆش ئەوێ

دڵپیسی لە دار و بەرد ئەکەم

ئەو جلوبەرگانەش لەبەریان دەکەی

ئێرەییان پێدەبەم

سەیرم دێ گوڵم

هەموو شتێ ڕەنگی تۆ دەگرێ

خۆر کە دەتبینێ

شەرم دایدەگرێ

کاتێ زەردەپەریش

خەریکە ئاوا بێ

لە جوانیدا

وەک تۆ نابێ وەک تۆ نابێ

دڵنیام شەوانەش

کە تۆ دەرکەوی تاوێ

ئاسمان مانگ و ئەستێرەی ناوێ

چی بڵێم ئەی ئەو شۆخەی





لە جوانیدا نغرۆو مەستی

تۆ لەناو ڕوحما

چێنەری ووشە و هەڵبەستی

عەشقت وام لێ دەکا

خۆشەویستیت لەسەر دار و بەرد بنەخشێنم

هێندەم خۆش دەوێی زۆر جار خەریکە

لێرە و لەوێ ناوت بێنم

لەگەڵ خۆشەویستی روحی تۆدا

ووردە ووردە مناڵ دەبمەوە

بۆیە بە هەستێکی زۆر مناڵانە

شیعرەکانم دەنوسمەوە

نامەوێ شیعرەکانم

لە ناسکی تۆ لادەن

بۆیە بمبورە ئەگەر

زیاد لە پێویست سادەن

خۆ ئەگەر هەستی شیعر

مناڵانە نەبێ

رەنگە بە گوێی

شۆخێکی مناڵ ئاسا دانەچێ

حەز ئەکەم هەموو شتێکم لە تۆ بچێ

باپێم بڵێن شاعیری تایبەتی کچێ

ئەوەی تەنها من دەمەوێ

هەست بکەی تۆم خۆش دەوێ

رەنگە هەستی پێبکەی

رەنگە گرنگی پێ بدەی

بەڵام زۆر بە نهێنی

بە نیگاوە دەیدرکێنی

من لە ئاستی تۆ پڕم لە گومان

بۆیە وا کەوتوومە ناو خەیاڵێکی تەم تومان

خۆزگە تێت دەگەیشتم

رۆژێ پێت دەگەیشتم

خۆزگە ئەو کەسەی شیعری بۆ دەنوسم

دەبوو بە هەناسەی ژیان و چارەنوسم

ئاخ شیعر چەند دڵپاکی

لە چاوەڕوانیدا چەند بێباکی

ئومێدت لێ نابڕێ

هەست بەبێ هیوایی ناکەی

خۆت ئەکەی بە قوربانی یەکێ

گەرچی بشزانی پێی ناگەی

## منیش وەک تۆ





پڕم لەشەرم

حەز دەکەم هەمیشە

بەرگی تەنیایی بکەمە بەرم

منیش وەک تۆ

لێوان لێوم لە خەیاڵ

مەلی دڵم

زوو زوو دەدا لەشەقەی باڵ

هەمیشە دڵم ئازار دەچێژێ

چونکە زۆر بە ئاسانی

نیگای تۆ ڕای دەکێشێ

من دڵم بوەتە کەلاوە

بە برژانگی زۆر کچ هەڵواسراوە

بەڵام تۆ دڵت زۆر جێگیرە

لەبەر دەستتا زۆر ئەسیرە

تۆ بە کورتە نیگا

دڵمت فڕاندووە هۆ گوڵێ

کەچی من بە شیعر و قەڵەم

بە چاو و هەستم دڵی تۆم پێ ناجوڵێ

ئای من و تۆ چەند جیاوازین

چۆن بۆیەک دەبین

دوو ئاراستەی پێچەوانە

چۆن دەبنە یەک هەناسەی ژین

زۆر جار دەڵێم

برواش ناکەم پێچەوانە بین

دڵنیام هەر لەیەک دەچین

دەنا ئەم هەموو دێڕانە

چۆن دروست دەبن لەژێر دەستی من

ئەم هەموو خۆشەویستییەی تۆ

چی دەکا لەناو هەستی من

بێ هیوا نابم لێت

بروا بکە لەخۆت زیاتر

دڵم پێتەوە

بۆیە دەڵێم

دڵت ڕۆژێک

لە ئاستی من دەتوێتەوە.





## ( پرسیار )

هەر تۆ ناپرسی

خۆشم لە خۆم دەپرسم

چۆن  دەتوانم

هێندە عاشقت بم

زۆر جار دەپرسم

لەو دڵە سەرە ڕۆیە

بۆ ئەوەندە هۆگری تۆیە

چەند جار لێم بیستوە

هەروا دەڵێ

کە خەتای ئەوە

هێندەم خۆش دەوێ

ئیتر بۆ من دەدەیتە بەر پرسیار

ئەی خۆری جوانی پرشنگدار؟

## ( مەڵێ عاشقتربە )

هێندە عاشقتم

رۆژی سەد جار دەتوێمەوە

کەچی هەردەڵێی عاشقتر بە

هێندە دڵ ناسکم

چاو داخەی دەگریم

کەچی هەر دەڵێی

دڵرەقی دڵناسکتربە

هێندە عاشقتم حەز دەکەم

دڵم بکەمە ئینجانە

گوڵەخان بۆت

تابەسەر روحما بشنێیتەوە

چیتر مەڵێ عاشقتربە

لەوە عاشقتر بم

دەترسم تۆش

لەگەڵ منا بتوێیتەوە.





## ( شاعیری تۆم )

هێندە لە شیعرەکانم باست دەکەم

خەڵک لۆمەم دەکەن

وەک بەندەیەکی تۆو

شاعیری تایبەتی کچێک

ناوم دەبەن

خۆشم حەز ناکەم ئاوابم

ئەی خۆری جوانی ئەم دنیایە

بەلاَم چی بکەم

گەر بمەوێ شیعرێ بنوسم

باسی تۆ نەکا

بەو خوایە

بۆم نایە.

## ( خەیاڵی تۆ )

شەوانە

تا یادی تۆ لە دڵما نەخەوێ

خەو لە چاوەکانی من

هەرگیز ناکەوێ

بۆیە هەمیشە خەیاڵت

لەناو لانکەی شیعرێکا ڕادەژێنم

وەک مناڵ

بەلایە لایە دەی خەوێنم.





## ( کەی بەتۆ دەگەم )

چیت بۆ بنوسم چیت بۆ بڵێم

کە تۆ هیچ نابیستی

دەزانم هەڵە بووم گوڵم

بەڵام ناچار بووم کە خۆشم ویستی

بۆ خۆشەویستی ئەو چاوانەت

ئەوەی هەم بوو بەخشیم پێت

ئێستا تەنها روحم شک دەبەم

دامناوە بۆ تۆ نایشارمەوە لێت

ووشە نەما لەفەرهەنگا

بۆتی نەنوسم و پێتی نەڵێم

کەچی ئێستاش من تێناگەم

بە کام یاسای ژیان تۆ خۆشت دەوێم

گەر تۆ دڵۆپێک لە دەریای

زمانی ووشەکانم بگەیشتایە

دەبوو ئێستا دڵت دەروێشی

تەکیەو خانەقای دڵی من بوایە

من تۆم دروست کرد لە شیعر

چی شیعریش هەیە لە تۆوە بۆم هات

وا ژیان و مردن بەیەک گەیشتن

ئەی ئەو دڵەی من کەی بە تۆ دەگات؟

**( تورەمەبە )**

تورە مەبە کە بۆت دەنوسم

خۆشم دەوێی و دەتپەرستم

وا مەزانە ئەو ساتانە

ئاگام لە خۆم نیە و مەستم

کە تێبگەی لێم دەزانی

من کوفر نیە مەبەستم

هەرگیز ووشەیێ دروست نابێ

خوا پێی ناخۆش بێ لەناو هەستم

بەڵام ئەو ساتانەی لە بێ تۆییدا

دڵ پەرێشانم گەلێ پەستم

حەز ئەکەم بۆ دڵنەوایی خۆم

هۆنراوەیەکت بۆ هەڵبەستم

کاتێ دەستم ئەدەمە قەڵەم و

دەیخەمە ناو پەنجە و دەستم

بێ پرسی من ئەو دەنوسێ





ئەوەی تۆ خۆشت دەوێ من دەیپەرستم

لێرە بە دوا چیتر مەڵێ

لە شیعرەکانت زۆر تورە و پەستم

خۆت پێیان بڵێ با وا نەنوسن

بە قەڵەم و پەنجە و دەستم.

**( تکا )**

ئەزانم لەوە گەورەتری

بێیتە ناو دڵی منەوە

دەزانم ناچیتە باوەشی

سۆزی شاعیرێکی وونەوە

دەزانم روحت گەورەیە و

خۆت بە ئاستی کەس نازانی

خوا پێداوی

هەموو گیانت پرە لە جوانی

دەزانم دەروازەی دڵت

لەوەتەی هەی هەر داخراوە

ئەوەی لەرووتا وەستابێ

دەستت بەڕوویەوە ناوە

دەزانم من و تۆ

هەرگیز بۆیەک نابین

خوا وای دروست کردووین

لە هیچا لەیەک ناچین

بەلاّم چی بکەم لەو دڵەم

هەرچۆنیٚ بی خۆشی دەویٚی

تکایەچیتر پیٚم مەڵیٚ

من دەچمە کویٚ تۆش لەویٚی.

**( قیبلەیشیعر )**

داوای شیعرم لیٚ دەکەی

خۆ ناتوانم دڵت بشکیٚنم

بەلاّم شیعریٚک بە دڵی تۆ بیٚ

نازانم لە کویٚی بیٚنم

زوو زوو وولاّم دەنیٚری

دەڵیٚی شیعرم لیٚت دەویٚ

کە تۆ نەیەی شیعر چۆن دیٚ

قەزات لە شیعرم کەویٚ

شیعر نوسین لام ئاسانە

بەلاّم شیعریٚ بۆ تۆ بیٚ جیایە



خۆشەویستیت کۆتایی نایە ................ خالید ئەشکەنەیی

لە ترسی ئەوەی بە دڵت نەبیٚ

پەنجەم دەلەرزیٚ هیچم بۆ نایە

قیبلەی شیعرەکانی من

ئەو جووتە لیٚوەی تۆیە

کەچی هەمیشە بیٚ دەنگن

سور هەڵگەراون بە بۆیە

لە سەیری چاویٚکتا

بۆم دیٚ سەدان هۆنراوە

بەلاّم خۆ ئەو چاوەی تۆ

لە رووی منا هەر داخراوە

کە وا بیٚ گوڵم پیٚم بڵیٚ

شیعرت لە کویٚ بۆ بیٚنم

ئەمجارە داوای شیعرکەی

بەڵێن بیٚ دڵمت بۆ دێنم

## (کاغەز)

گەر دەڵێی

ڕقم لە نوسینی کاغەزە

بۆم مەنێرە نامەویٚ

دڵم دەکەمە پەڕەیەک

بۆت تیادەنوسم

تۆم خۆش دەویٚ

یان دەڵێی





ڕقم لە نوسینی مەرەکەبە

کە تەڕ بوو کاڵ دەبێتەوە

پەنجەکانم دەکەم بە قەڵەم

بە خوێن دەنوسم دڵم پێتەوە.

## (دڵی شیعر)

هێندە بیرت لیٚ دەکەمەوە

زۆرجار مێشکم دەوەستیٚ

تەواو تەواو بێزار دەبم

پەنا دەبەم بۆ هەڵبەستیٚ

هەڵبەستیٚ ئەو خەمەی تۆ

لە جێی من بگرێتە باوەش

بەلاّم کوا خەمی تۆی پیّ هەلّدەگیریّ

شیعری چارە ڕەش

بۆیە دەلّیّم با هەر دلّم

گانگای خەم بیّ بە تەنیّ

دلّی شیعر زۆر ناسکە

با توخوا خەمی نەدەمیّ.

**( ویّنەی خەیالّ )**

زۆر لە قەلّەمەکەم نارازیم

چونکە هەست دەکەم ناتوانیّ

بە باشی خەیالّم بنوسیّتەوە

هەر شیعریّکیش

ویّنەی خەیالّم نەکیّشیّ

ڕقم لیّی دەبیّتەوە

بۆیە گولّم بمبورە

گەر ئەوەی لە شیعرەکانما دەیبینی





پیّت کەمە

خۆشەویستیت لەوە زیاترە بەلاّم

هەر ئەوەندەی پیّ دەرئەبڕیّ

ئەو توانایەی هەمە

ڕقم لە پەنجەکانیشم دەبیّتەوە

حەز دەکەم چی پەنجەم هەیە بشکیّ

هەلّوەرن دلّۆپ دلّۆپ

خویّنیان لیّ بتکیّ

چونکە هەست دەکەم نەیانتوانیوە

عەشقی ئەو کچەی پیّی مەستم

بەدلّی خۆم ویّنەی بکیّشن

لەناو فەنتازیای هەلّبەستم.

**( تۆ و شیعر )**

خەمی تۆو شیعر

زۆر لەیەک دەچن

هەردووکیان

لە شویّنیّکا دروست دەبن

هەمیشە بە تامەزرۆیی

تیّک ئەهالّیّن

وەک بە تۆ ناڵێن

بە منیش ناڵێن

بۆیە هیچ کامیان بیٚ ئەویتریان

ساتێک لەلام نابێتە میوان.

**( خۆزگە )**

خۆزگە چاوەکانم

جووتیٚ چرابان

شەوانە

لە ڕووی تۆدا هەڵکرابان

خۆزگە روحم

بشیابا بۆ دیاری





تا لەلای تۆ

دامنابا بۆ یادگاری

خۆزگە لە شێوەی حەرفیٚ

دروست کرابام

تا بە ملوانکەی گەردنتەوە

هەڵواسرابام.

**( خۆشەویستیت خوێنە )**

خۆشەویستم

کاتیٚ خەیاڵت دڵم پڕدەکا

کاتیٚ ڕەشەبای خەمت حاڵم شڕدەکا

هیچ شک نابەم

جگەلەوەی شیعریٚ راسپێرم

هەندیٚ ڕازوگلەیی بۆ تۆ پیابنێرم







ئەمجارەش بڕیارم دا

بەنامەیەک بەسەرت کەمەوە

نەکا ئەمشەو بمرم

بە دەست ئەم خەمەوە

حەز دەکەم سەرەتا

بەوە دەست پیَ بکەم

پڕ بە دلْ گلەیت لیَ بکەم

گلەیی ئەوەی

کەمن  هیَندە شەیدای تۆم

کەچی بەلاتەوە

هەر کوڕیَکی نامۆم

گلەیی زۆر شت

بەلاّم دلّم نایە

لە گولْ کالّترت پیَ بلّیَم بەو خوایە

بۆیە گلەیی وەلا دەنیَم

تاویَ لە هەستمەوە

لەگەلّتا دەدویَم

خۆشەویستم

نازانم باسی چیت بۆ بکەم

چۆن چۆنی





باسی خۆشەویستی تۆ بکەم

تۆ نازانی هەمیشە

خەیالّم چۆن بۆت دەفڕیَ

بۆ دیداریَکت

دلّم چۆن گڕ دەگریَ

کوا تیَدەگەی

لە رازی دلّی پڕ جۆشم

کوا دەزانی کە هەمیشە

خەیالْ و مەست و بیَ هۆشم

**ئەی کچی جوان**

**ئەی شیرینتر لە شیرینی**

**تۆ لە دڵما**

**کچ نیت برینی**

**برینێکی لێوان لێوی لە ئازار**

**زادەی بۆ هەزاران ناڵەو هاوار**

**دەیانکەمە شیعر**

**ناڵەو هاوارەکانی خۆشەویستی**

**بۆیە تۆ هەستیان پێناکەی**

**بۆیە تۆ نایان بیستی**

**کەلەگەڵتا ئەدوێم**

**جیاواز لە هەموو دەنگێ**

**دەنگت دێتە بەرگوێم**

**زۆر سەرسامم**





**بە جوڵەت بەدەربڕینەکانت**

**بەنیگای چاوت بە ووتە شیرینەکانت**

**زۆر جار گومان دەکەم لێت**

**کە دەڵێی خۆشم دەوێی بڕواناکەم پێت**

**بڕواناکەم هەرگیز**

**خۆشەویستی دوو دڵ وابێ**

**دڵێ لە بەهارا و یەکێ لە خەزانابێ**

**بەلاَم گوڵم هەرچۆنێ بیت**

**لەناو دڵما دەرناچی**

**بژرانگی چاوەکانمی**

**کوێر دەبم لەسەریان لاچی**

**هەر چۆنێ بی خۆشم دەوێی**

**ناتوانم دووربم لێتەوە**

**چونکە لە جێی خوێن**

**خۆشەویستی تۆ**

**لەناو دەمارەکانما دەسوڕێتەوە.**

## ( چاوەکانم )

**بمبورە**

**کە چاوەکانم کەمێک سەرەڕۆن**

کە هێندەی شەیدای بینینی تۆن

بمبورە کە بێ سنور

لێت دەڕوانن

تێرنابن لێت شەرم نازانن

زۆر پێیان دەڵێم ئاقڵ نابن

لەوە ئەچێ وەک دڵم

ئەوانیش بە تۆوە مابن

جاران هەر دڵم بێت نەئەسرەوت

شوێن پێی هەڵدەگرتی و

دواتت دەکەوت

ئێستا چاوەکانیشم بوونەتە هاوڕێی

وەک دڵم ڕاهاتون خۆشیان بوێی





ئەوانیش فێربوون ئازارم دەن

هەموو چرکەیێ بیرت کەن

فێربوون هەموو ساتێ

بەدواتا بگەرێن

کەنەت ببینن

لەگەڵما بەشەڕبێن

بڕوا بکە لەو رۆژەوە

تۆیان خۆشویستوە

وەها بە دوتا دەگەڕێن

هەمیشە دەڵێی

شتێکیان لێ وون بووە.

**( خۆشەویستی مەحاڵ )**

خۆشم سەرم سوڕماوە

چۆن دەتوانم هێندە شەیدات بم

لە کاتێکا بروا ناکەم

هەرگیز ڕۆژێ بێ پێت شاد بم

هەرگیز لە خۆشەویستیت

چاوەڕێی ئەنجام ناکەم

ناتوانم دەست بەردارت بم

گەر بشزانم پێت ناگەم

چونکە خۆشەویستیت

لەژێر دەسەڵاتی من دەرچوو

هەستێکە لە دڵما خۆشم نازانم

کەی و لەکوێ و چۆن دروست بووە.





**( ڕازی دڵ )**

ئەی ئەو شۆخەی

دڵت لێوان لێوە لە نهێنی

دەزانم خۆشت دەوێم

ڕووت نایە بیدرکێنی

دەزانم وەک من گیرۆدەتم

تۆش گیرۆ دەمی

دەزانم شەوانە تۆش

مەستی خەیاڵ و خەمی

دەری برە بیدرکێنە

ئەو ڕازەی‌لەدڵتایە

بالە تەنیایدا نەمرین

تەنیایی هەر بۆ خوایە.

## ( هەناسەی ژین )

ڕێگەم بدە با پەنجەکانم

تاویٚ لەناو پرچتدا بخەوێنم

با هەناسەکانت هەڵمژم

کاروانی خەمیٚ بڕەوێنم

سەیرم کە بابە پرشنگی نیگات

چاوەکانم داگیرسێن

بابەسۆزی خەندەیەکت

ئازارەکانم دامرکێن

خۆتم لیٚ وون مەکە

شازادەی وولاٚتی ئەوینم

خوا ئەزانیٚ ئێستا

وەک هەناسەی بۆ ژینم.





## ( تۆ )

گەر تۆ ئەوە نەهێنی

بم سوتێنی بمگرێنی

دەبیٚ چی شایستەی ئەوە بیٚ

چی ئەوەندە گەورە بیٚ

بۆی بمرم وبۆی بژیم

بۆی بسوتێم و بۆی بگریم

گەر مردن وژیان

سوتان و گریان

شایستەی تۆ نەبیٚ

ناژیم تۆ بە بیٚ.

## ( خەیاڵی پرچت )

پێش تۆش

گەلێ شیعرم نووسیوون

زۆر ووشەی ناسکم

بەیەکەوە هۆنیون

بەڵام کە تۆم ناسی

شیعر بوو بە تاجی سەرم

ئێستا واهەست دەکەم نوسەرم

زیاتر لە هەموو شاعیرێ

شیعرەکانی خۆم دەخوێنمەوە

چونکە هەموو شیعرێ

بە خەیاڵی پرچت دەهۆنمەوە.





## ( من و تۆ )

تۆ

تازە پێدەکەنی بە دەم دنیاوە

من

تەلاری ئاواتم رووخاوە

تۆ

لە دەمت گوڵ دەبارێ

من

بەباڵاما خەم دێتە خوارێ

ئاخر من و تۆ

چۆن بۆیەک دەبین

پەریزادەی ناسک و خوێن شیرین.

( جەژن )

ئەوا جەژنی سەری ساڵە

بەقەد بەرزی ئەم خودایە

پیرۆزبایی ساڵی تازە

گوڵم بۆ تۆ لە دڵمایە

بڕوا بکە هیچ شک نابەم

ئەم پیرۆزبایەی پیا بنێرم

بەڵام کەمێک چاوەڕێم کە

سبەی دڵمت بۆ دەنێرم.

***********

لەم جەژنەدا

هیچ بە شایستەی ئەوە نازانم

بیکەمە دیاری

بۆ تۆی دڵ و گیانم





تەنها دڵم شک دەبەم

گەر دەتەوێ دەری بێنە

بۆ ساڵیادی لە دایک بوونت

لە جێی مۆم دای گیرسێنە.

( ئێوارەخەیاڵێك )

ناهێڵم تەنیابیت

ئێرە جێ مەهێڵە

گەڵای بەختم

مەدەرە دەست ڕەهێڵە

تەنیانیت

سەرنج بدە دەوروپشتت

من لێرەم

وەرە دڵم خەمە مشتت

جووتێ چاوی کاڵی ڕەنگ خۆرهەتاو

بۆ ئاوا دەکەی

لە ئێوارەی بەجێماو

گەر بێزاری دەتگرێ بە تەنیایی







دڵم دەربێنە

بەڵکو پێت بدا دڵنەوایی.

**( گومان )**

کە من بۆ تۆ هەموو تەمەنم

بووەتە چاوەروانی

پاشی چی خۆت وا دەردەخەی

کە بەهیچ نازانی

کە دڵت لە ئاستی من

دەریایەک خۆشەویستی تیایە

چۆن دەتوانی وای نیشاندەی

کە لەئاستم بیٚ ئاگایە

تۆ لەچی من دوو دڵی

لەچی من گومانت هەیە

خۆشەویستیت بۆخۆت چەندە





هی من بۆ تۆ سەد هێندەیە.

**( خوازبێنی )**

گەر سەرتاپای هەڵسوکەوتت

پڕنەبوایە لە نهێنی

دڵم تا ئێستا سەد جار

بۆ دڵت ئەهاتە خوازبێنی

گەر بەنیگای تیژ ڕەوت

ترسم لە عەشقت نەمابا

دەبوو هەموو رۆژیٚ هاتبام

لە دەروازەی دڵتم دابا

گەر روخساری مات و بیٚ دەنگت

نەبوایە کۆسپ لە ئاستم

**دەمێک بوو بۆم هەڵدەڕشتی**

**خۆشەویستی پاک و ڕاستم.**

## ( خۆشەویستیت هەرخەمە )

**هەرچەندجارێ چاوت**

**بە نهێنی لەگەڵما ئەدوێ**

**زیاتر خۆشەویستی تۆ**

**لە دڵما ئەڕوێ**

**هێندەم خۆش دەوێی هەمیشە**

**لەناو هەستمدا شەپۆل ئەدەی**

**وەها ڕژاویتە ناو ئەندێشەم**

**خەریکە شێتم ئەکەی**

**خۆشم سەرم سورماوە**





**لەو خۆشەویستیەی من بۆ تۆ هەمە**

**چۆن دەتوانم هێندەم خۆش بوێ**

**کە خۆشەویستیت بۆ من هەر خەمە.**

## ( باران )

**کە منالێ بووم**

**ڕقم دەبۆوە لە باران**

**چونکە مەحرومی دەکردم**

**لە گاڵتەو گەپی ناو کۆڵان**

**دوای منالێش حەزم نەدەکرد**

**هەرگیز باران بباریێ**

**وامدەزانی دڵۆپەکانی بەردن**

**بەسەرما دێنە خوارێ**

**بەڵام ئەو ڕۆژە باراناویەی**

**هاتیە لام هەمیشە لە خەیاڵمایە**

**تەڕببوی خۆت کرد بە باوەشما**

**ووتت زۆرم سەرمایە**

ئیتر لەو رۆژەوە هەست دەکەم

باران شتێکە وەک تۆ جوان

چونکە هەر رۆژێ باران بێ

شەرم ناکەی لە تێک ئالأن

دوعا دەکەم چوار وەرزی ساڵ باران بباریٚ

تۆش هەمیشە سەرمات بێ

بۆ ئەوەی باوەشی گەرمی من

هەردەم مەنزڵ و جێگات بێ.

**( خەمی گەورەیی )**

تادێ لە ژیان پیرتر دەبم

کەچی لەگەڵ تۆدا

وورده وورده منالٚ دەبمەوە

چۆنت بوێت خۆم وا لیٚ دەکەم

یا لەسەر دڵت کالٚ نەبمەوە

پێم دەڵێن شیعرەکانت

زادەی هەستێکی منالأنەن

نازانن کە لەچاو تۆدا

پیرێکی هەشتا سالأنەن

خۆم داوەتە دەست نازی منالٚیت





گرنگ نییە ڕاست بم یا هەڵە

ئێستاش ئامادەم لەگەڵتا بیکەم

یاری پەڕۆ و بوکەڵە

توخوا مەهێڵە

قەت منالٚی لە دەست دەم

گەورەیی چیە ئاخر

جگەلە مەینەتی و ئازارو خەم.

81

**( حەزناکەم خۆشم بویٚ )**

گەر خۆشەویستی

کاری عەقڵ بوایە

حەزم نەدەکرد

تۆم خۆشویستایە

بەلأم چی بکەم کاری دڵە

دڵیشم بەجۆریٚ شەیدات بووە

لەبەر تۆ

منی بیر چووە

چی بکەم لەو دڵەم

لەلای دروست بووە هەستێ

لە ترسی ئەو خوایە نەبێ

ئامادەیە بتپەرستێ.

**( مەنهەجی شیعر )**

گەر هات و

لەمەنهەجی تۆ لایدا شیعرم

دوعا دەکەم بەخۆ بەشیعر

فەنابم بمرم

گەر لە جێی تۆ

کەسێکی ترم کردە خۆشەویستم

حەز دەکەم کەڕوڵاڵ بم

هیچ نەبیستم





پێتبگەم و پێت نەگەم

خۆشم ویستوی خۆشم دەیوێی

کانیاوێکی لە ئیلهام

لەناو هەستمدا هەڵدەقوڵێ.

**( خۆشەویستیت دەگرم )**

لەناو خۆشەویستی تۆدا

خۆم وون کردوە

بە چاوی تۆ

کەسم وەک تۆ خۆش نەویستووە

بێ پرس

عەشقت هاتۆتە هەستمەوە

ڕژاوەتە

ناو دەماری پێنوسی هەڵبەستمەوە

هەموو ساتێ وەکو پرشنگ

دەرژێیتە ناو سپێدەی چاومەوە

رێژنە دەکەی

بەسەر بیابانی دڵی هەڵقرچاومەوە

عەشقت بووەتە دەرسێ

تا دێ گرنگی پێدەدەم

وەک چۆن درەخت گەڵا دەردەکا

منیش خۆشەویستیت دەردەکەم.

**( خەم بەس نەبێ )**

لەگەڵ عەشقت

پیر بووم

تەنیا و نامۆ و گۆشە گیربووم

لەگەڵ عەشقت

بووم بە خۆڵەمێش

گەنجیم پر بوو لە ئازار و ئێش





ئەی کچی خەم

کەی وەڕەس ئەبی

کەی تێر هەوەس ئەبی

لە ئازارم لە گریانم

خۆ تۆ  هەناسەی بۆ ژیانم

پێم بڵێ

کەی خەم کۆتایی دێ

بەس نەبێ

ئینجا سەرەی خۆشی بێ.

**( خۆشەویستیت لەدڵما جێی نابێتەوە )**

کەی پێ دەزانی

کەلە ئاستم بێ ویژدانی

کەی دڵت بەئاگادێ

کە خۆشەویستی وا نابێ

کەی تێدەگەی

لە نیازم لە مەبەستم

لە ڕازی ڕاشکاوی هەڵبەستم

کەی دەگەیتە دواین بڕیار

ئەی کچی کاڵ و هەرزەکار

دەکرێ هەروا چاوەرێت بم

بە دەست مناڵیتەوە شێت بم

دەکرێ بەرامبەرم

هەروا بێ هەست بی

بە دەست گومانەوە مەست بی

خوا ئەزانێ

لەخۆم زیاتر دڵم پێتەوە

خۆشەویستی هێندە زۆرە

لە دڵما جێی نابێتەوە.

## ( بابتوانم ئاگام لێت بێ )

خۆ دەزانم بەجێم دێڵی

وەکو فرمێسکێکی چاوم وەکو هەناسەیەک

تۆش ماڵئاوایم لێ دەکەی

لە دڵما دەبیتە تاسەیەک

خۆ جێشم بێڵی ناتوانم هیچ بکەم





جگەلە هەڵڕشتنی دەریایێ فرمێسک و

خواردنی دنیایێک خەم

کە ڕۆیشتی لە پڕێکا جێم مەهێڵە

ئەستەمە بەرگەی ئەم کۆستە بگرم

تۆ تێکەڵاوی روحم بوویت

دەترسم تۆ بڕۆی منیش بمرم

خۆ ژیانیش هێندە خۆش ناوێ

دوای تۆ با مردن هاورێم بێ

بەڵام بۆیە حەز دەکەم بژیم

دەڵێم نەکا جارێکی تر

پێویستیت پێم بێ

بۆیە کە ڕۆیشتی دڵم مەکوژە

با توخوا هەرچاوەرێت بێ

ئەوەندەش ژیان بە من ببەخشە

کە بتوانم ئاگام لێت بێ.

## ( کچی بێ هەست )

ئای چەندە بێ زمانم

گەر ڕۆژێ دەنگم تێکەڵی دەنگت نەبێ

ئای چەند کزبینم

گەر ساتێ چاوم نغرۆی ڕەنگت نەبێ

وا تێنەگەی بە ڕاسیتمە

گەر جار جارە زویرت دەکەم

بروا بکە لە چرکەیەکا

سەدان جار بیرت دەکەم

قەت ناڵێم ئەوە منم

ئەو هەموو خۆشەویستیەم هەیە

بۆ ئەو کچەی عەشق لەلای

تۆزوخۆڵی سەر ڕێگەیە.

قەت بروام نەبوو شێت بم بۆ یەکێ

کە خۆشەویستی لای ئەو

بریتییە لەخەیاڵ وخەو





ئەی ئەو کچەی

باڵای خۆشەویستیت لە ئاسمانە

دڵت نییە

یان هەتەو بێ ویژدانە؟

ئەی ئەو کچەی

خۆشەویستیت لە دڵما وەک ئاگرە

پێم بڵێ لە ژیانا

چی لە خۆشەویستی جوانترە؟

( **نیگای ئێوارە** )

سەیرم مەکە

چاوم تیشکی خۆشەویستی تیا نەماوە

بەختم دارێکی ڕووتەڵە

خەزانی عەشق لێی داوە

چاو مەخشێنە

بەسەر روخساری نامۆی روخاوم

بیٚ هیوام سۆز مردوم دڵشکاوم

هیچ شک نابەم

لەگەڵتا بیگۆرمەوە بە نیگایێ

بەر لە تۆ دڵمدا بە خۆریٚ

ئێستا ئەویش لە ڕووما هەڵنایێ

زۆر دەترسم

لە نیگای دەمەو ئێوارە





لەو شۆخانەی

خەندەیان لەسەر زارە

نیگایێک چارەنوسی منی

بۆ ژێر گڵ برد

بزەی شۆخیٚ

منی بیٚ هیوا منی بیٚ دڵ کرد

ئیتر چۆن بتوانم

لە نیگای شۆخی رابمێنم

چۆن بوێرم

چینی ناسکی تەنیایم

بۆ خەندەیەک پیٚ بشکێنم.

**(شۆخی بەهاری)**

بەم جلە سەوزانەتەوە

دەڵێی بەهاری

چەند جوانی

بەم پاییزەش سەوز دیاری

گەش گەش

وەک درەختێکی قژ تەڕ

ئەبریسکێیتەوە

لەگەڵ خۆرا کەوتویتە شەڕ

ڕووت بەفرە

لە کۆچی زستان بەجێماوە

لەسەر ترۆپکی ئەم بەهارەو

ژێر سایەی ئەم قژە خاوە





لێوان لێوی

لە شیرینی و سەرنج و جوانی

جوانیت لێ هەڵدەقوڵێ

نەرم نەرم وەکو کانی

بەم جلە سەوزانەتەوە

لەبەرچاوم وەکو بەهار دەنەخشی

سەوزی و جوانی

بە ڕەنگی ئەم پاییزە دەبەخشی

دڵت هەمیشە بەهارە

بوار بە هیچ وەرزێکی تر نادا

بۆیە لە زمانی

ئەم دڵە پاییزەی من ناگا.

**( درۆ )**

تادێ تۆ لە دڵما

گەورەتر دەبی

عەشقت زیاتر لەناخما چرۆ دەکا

کەچی سەیرم دێ

ئەم دڵەی تۆ

لەگەڵما هەر حەز لە درۆ دەکا

خۆ دەزانم

لە دڵی شاعیر ناسکتر و

لەخۆشەویستی گەورەتری

خۆشم دەوێی

گەرچی ئەشزانم

بۆ پەروانەی ئاواتم

وەک ئاگری.





**( دوودڵ )**

کە من

سەدان فرمێسکم

بۆ تۆ لەچاو ڕشت

کە من

دەرگای دڵم

بۆ خستویتە سەرپشت

کە تۆ گوڵی و

چاوەڕێی مشتێ گڵی

کە دڵی منیش ئینجانە بێ

بۆ نایێی ؟ لەچی دوو دڵی ؟

## ( ڕەنگ ودەنگی تۆم گرتوە )

ئێستا سەیری کەس ناکەم

هەمیشە چاودائەخەم بە غەمگینی

ئەوەندە سەیرم کردووی

دەترسم یەکێ لەچاوما تۆ ببینی

هەمیشەش بێ دەنگم

با هەر پێم بڵێن کوڕێکی نامۆیە

ئاخر چۆن بوێرم بدوێم

کە هەموو وشەیەکی سەر زمانم

پێنج پیتەکەی ناوی تۆیە.





## ( ترسێك )

لەو رۆژەوە تۆم بینیوە

پێڵوی چاوم

بە روخساری تۆ داپۆشراوە

بوویتە سۆزی شەوانی تەنیایم

بۆ نوسینی سەدان هۆنراوە

زۆر دەترسم ئەو کەسانەی

چاویان بە شیعرەکانم دەکەوێ

تێبگەن و بزانن

کە من تۆم خۆش دەوێ.

## ( هەستێکی ئاوی )

توڕە مەبە کافر دەبی

بە نسیبی ئاگر دەبی

توڕەمەبە ئەی دڵ گەورە

توڕەبونت وەکو هەورە

ئەمداتەبەر ڕێژنەی خەم

ئاسمانم لێدەگری بەتەم

توڕە مەبە

ئەی هەناسەی تەمەنی لاویم

با لێڵ نەبێ لە ئاستت

هەستی ڕوونی ئاویم.





## ( ئێوارە )

ئێوارەیە

دەگەڕێم بە دوای پرچی کچێ

تاخەمەکانم لەگەڵیا بەبادا بچێ

دەگەڕێم بەدوای نیگای چاوێ

تا بەسینەم ببەخشێ حەرفی ناوێ

بەدوای برژانگی شۆخێکا وێڵم

تاخاکی پر خەمی دڵمی پێ بکێڵم

ئێوارەیە

زۆر تینوم بۆ سۆزی دڵێ

تا نزرگەی ئەوینێ

بەم دڵە شێتەم بڵێ

ئێوارەیە

بەدوای باڵای کیژێکا ئەگەڕێم







تاوەک درەخت

گەڵا گەڵا بەسەریا هەڵوەرێم.

## ( پرچت لادە )

پرچت لادە

ڕێی لە تیشکی چاوم گرتووە

کەی تێئەگەی

ڕۆژانێکە دڵمت بردووە

با بەفرو گوڵ و مانگ دەرکەون

با ئەو ئەستێرانە ببینم

هەمیشە مەست و پر خەون

پرچت لادە

دەمێکە چاوڕێی نیگاێکم

خۆ هیچ نابێ





گریمان منیش شنەباێکم

پرچت لادە

نەبا لە ئاهی من

گەردەلولێ هەڵبکا

پرچی تاڵ تاڵ و نەخشینت

بە زۆر لابدا.

## ( ناتوانم لەبیرت کەم )

دەڵێی لەبیرم کە جا چۆن دەتوانم

واخۆشم ویستوی دابران نازانم

چەند گرانە ئەوە لە توانای کێ دایە

دنیا تۆی بێ لەدڵم دەرنایە

دەشێ چاوم بینایی بیر چێتەوە

یا هەناسە لە روحم جیا بێتەوە

دەشێ دوای شەوخۆر دەرنەکەوێ

یا هەورو باران یەکدیان خۆشنەوێ

دەشێ دەریا گڕو بڵێسەی لێ هەستێ

یا ئاگر شەختە سەهۆڵ بیبەستێ

بەلاَم ناشیَ هەرگیز من تۆم بیر چێتەوە

گەر ڕوحیشم لە جەستەم جیا بێتەوە.

## ( سۆزی هاتنێك )

کە هاتی ئەم جارە

بەگوڵ باران دێمە سەر ڕێت

نەکەی پیَ بنێی بەئەرزا

تا دێم و دڵم دەنێمە ژێر پێت

کە هاتی با ئەو کاتە بیَ

کە تیشکی خۆر پەخش دەبێت

تا خەڵک وا بزانیَ تۆ نیت

خۆری بەیانیە هەڵدێت.





## ( من شاعیرنیم )

من شاعیر نیم

بەلاَم کیژۆڵەیەکم خۆش دەویَ

دڵی هێندە گەورەیە

شیعری بۆ نەنوسم ناسرەویَ

چەندجار بێت و

بەلاما ڕابېریَ

دەبیَ شیعریَ بنێرم

گەردی سەر ڕێگەی بۆ بسڕیَ

**من شاعیر نیم**

**بەلاّم خەمی نازی منداڵ ئاسای**

**ئەو کیژۆڵەیە کردومی بە شاعیر**

**هەر شیعری بۆ دەکەمە بوکەڵە و دەیڕێژیرێنم**

**کەچی لێی تێیانگەم لێم بووە بە ساحیر.**

**( کە دێی )**

**کە دێی  وەکو بارانی پاییز**

**گڵی ژێر پێت بۆن خۆش دەکەی**

**جەستەی وشکم**

**بە ئاونگی روخسارت تێر جۆش ئەدەی**

**کە دێی خەم ئەژنۆی دەلەرزێ**

**لەشەرما دەتوێتەوە**

**لە جێی هەر خەمێ**

**گوڵێ دێتەدەر دەشنێتەوە**





**کە دێی پڕ دەبێ لە فریشتە**

**سەرانسەری دەوری ماڵم**

**خۆشی دێنن خەمبار دەکەن**

**دەری دەکەن دەردی حاڵم**

**کە دێی قەڵەم و پەنجە**

**کاغەز و مۆم کۆڕ دەگرن**

**لە جێی شیعر بۆ خەم**

**جوانترین شیعر بۆ تۆ دەچڕن**

**کە دێیژوورەکەم پێ دەگرێ**

**دێ پێشوازیت لێ دەکا**

**فەرهەنگێ خۆشەویستی پێیە**

**دەی کا تەسرەحەیەک و**

**لەپرچی تۆی ئەدا.**

**( بادڵمان بگۆرینەوە )**

**یەکەم جار کە بینیمیت**

**عەشقت تێکەڵ بە خوێنم بوو**

**کە یەکەم نیگات تێگرتم**

**وەک بروسکە بەروحما چوو**

**لەو ساتەوە گوڵێ**

**نیگا سیحراویەکانتم تێئەگری**

**بەجۆرێ داگیرت کردووم**

وا خەریکە جەرگم دەبڕی

کە دێمە سەر ڕێت

زۆر حەز دەکەم ووشەیەک بڵێم پێت

کەچی دەترسم تورە بی

دڵی ناسکت لێم برەنجێت

گەر دەتەوێ من و تۆ

نمونەی خۆشەویستی بین

گەردەتەوێ وەکودیاری

دڵمان بەیەکتر بەبەخشین

جارێک لە درزی لێوەکانتەوە

بڵێ دڵم دیاری تۆ بێت

تا دڵی پڕ خۆشەویستیم

پیرۆزکەم لێت.

## ( حەزێکی شێتانە )

حەز دەکەم ببمە شانەیەک

لەناو پرچەکانتا خۆم بنوێنم

تا هەر کاتێ پێویستی کرد

قژی زێڕینت بۆ دابێنم

حەزدەکەم خوێنی جەستەم

بکەمە سوراو بۆ لێوت

ببمە سایە بۆسەر گۆنای





سوروسپی وەک سێوت

حەزدەکەم جارێ بێی

تۆزێ خەمم بیر بەیتەوە

بۆ جەژنی یەکتر شادبونمان

مۆمێکی نوێ هەڵکەیتەوە

خۆزگە هەمیشە وەک فریشتە

میوانی راست وچەپی گەردنت بام

هەمیشە چاکە نوسی سەر لێنوسی

باڵای بەرز و بەژنت بام

خۆزگە دواین ساتی ژیانم

لە باوەشی تۆدا سەری نابایەوە

وەکو مۆم لە باوەشی تاریکیدا

دوا دڵۆپی حەزم توابایەوە.

## ( تامەزرۆیی )

تۆ کە هەرشەپۆلی دەریا بی

منیش کەنارێکی هەڵقرچاو

بۆ نایێ بتگرمە باوەشم

بتوێینەوە ببین بەئاو

کەمن هەر پەیکەرە سڕبووەکەی

سەر ڕێگەی هات و چوونت بم

بۆنایێ دەست کەیتە ملم

ئاوێتەی گیان و بوونت بم
کەمن لە زیکری یادی تۆدا
پلەی سۆفی و فەنابوونم چڕیوە
بۆ لێم ناپرسی کە چۆن
سەحرای عەشقی تۆم بڕیوە
وامن لە گێژاوی خۆشەویستی
تۆدا گێژ دەخۆم
شۆستەکانی چاوەڕوانی
بە فرمێسکی گەش دەشۆم
دەوەرە لە خەونێکی ترسناکا
چاوە گەشەکانت هەڵبێنە
لەکاتی غەرق بوونم لە خەیاڵی شەوانەدا
بە دیدارێکت هەڵم ستێنە.

**( دڵم جێگەتە )**

کە ویستت بنوی وەرەلام
تا پێخەفی شیعرێکت بۆ ڕاخەم بتخەوێنم
باڵا پۆشت کەم لەوشەی ناسک
بلای بەرزی دیوانێکت بۆدانەوێنم
کە مردی لاشەی ناسکت
لەناو دڵما دەنێژم
بەفرمێسکی چاوم دەتشۆم
دواین دڵۆپی بۆتۆ دەڕێژم
ووشەکانی کۆشکی شاعیریم دەسوتێنم





دڵم دەکەم بە چراخانی شار
پەنجەکانم دادەگیرسێنم
بە دوورت دەگرم لە تارمایی قەبری تار
چی بڵیم لەمە زیاتر
ئەی پاڵەوانی داستانی عەشقی من
کام ڕێگرم دەگەم بەو خۆشەویستیەی
کە هاوتایە لەگەڵ دەریای بێ بن
بەسە چیتر وەکو سیحر
خۆتم لێوون مەکە و
وەکو منداڵ خۆتم لێ مەڕەنجێنە
گەر دەتەوێ دڵم بەرە
بە هەموو هەست و ئیلهامێکەوە
بەزیندووی دەری بێنە.

**( تۆ و ڤینۆس )**

تۆ ئەو پشکۆ ئاگرەی
کاتێک لە کێوە بەفرینەکانی بالآت
ڕوای عەشق دەکەم
جەستەی سڕبووم گەرم دەکەیتەوە
تۆ ئەو خەونە ئەهریمەنیەی

لەزۆربەی شەوەکانی تەمەنی لاویمدا

ئاوێزانی روحم ئەبی و

بۆلای خۆتم ئەبەیتەوە

تۆ ئەو تازە بووکەی بە چرپەیەک

لەدەرگای منی ئالودەبوو دەدەی

چرای خامۆشم

بەتیشکی چاوت هەڵدەکەیتەوە

تۆ ئەو ئەستێرەی لە دنیای جوانیدا

کە گرۆبکەی لەگەڵ ڤینۆس

لەسەر جوانی

بەخوا مەترسە تۆ دەیبەیتەوە.

( **چنە** )

هەر کچێ

قژی کورت و پڕ و دوو ڕەنگ بێ

چاوی قاوەیی مەست و

ڕوخساری مات و بێ دەنگ بێ

هەر کچێ هەمیشە خەواڵو و





نیگاکانی ئاگراوی بن

پێنج پیت وشەش نوکتە

تابلۆی ناوی بن

هەرکچێ پەرچەمی

بەسەر چاو و برۆیدا بوبێتە تاڵ

هەستی سادە وساکار بێ

وەک منالێ

هەرکچێ زوو زوو

چاو دابخا

هەمیشە حەز بکا

یەکتر ببینین دوابخا

خۆشم ئەوێ

ئەزانی بۆ ؟

چونکە لەبەرچاوم

ئەبێ بە تۆ.

( **بمبورە** )

ڕەنگە هەر کەسێکی دەوروبەرمان

چاوی بە شیعرەکانم کەوێ

هەست بەوە بکا و بزانێ

کەمن تۆم خۆش دەویٚ

چونکە زۆر نیشانەم وتوی

بمبورە گەر جار جارە

لە هەندیٚ دیٚرا ناوم بردووی

بۆیە ئەگەر لیٚرە بەدوا

خەڵکی سەرنجیان لیٚدای

بە هیٚمنی ڕوو وەرگیٚرە

باوا بزانن تۆ بیٚ ئاگای.

## ( خۆشەویستیت )

خۆشەویستیت

ئەستیٚرەیە ئاسمانە





مانگە خۆری ژیانە

خۆشەویستیت

دەریا و زەریایە

تا ژیان مابیٚ

کۆتایی نایە.

## ( چۆن دڵت هات )

وەک ڕوح و دڵم خۆشەویست بووی







بەقەد هەناسەم تۆش پێویست بووی

وەکو شیعر لەلام بەرز بووی

بۆمن و ئاسمان و ئەرز بووی

ئەی روح و دڵی پرتاسەم

ئەی خۆشەویسترین هەناسەم

ئەی شاکاری شیعری بەرزم

ئەی پاشای ئاسمان و ئەرزم

چۆن دڵت هات جێم بهێڵی

جەرگ وهەناوم بکێڵیی؟

**( ئازاری دابڕان )**





گەر سوێی زامی دابڕانت

بە فرمێسک بشکایەوە

هێندە بۆت دەگریام

تاخوێن لەچاوم هاتایە

گەر کۆستی جیابونەوەت

بە مردنم کۆتایی دێ

تا ئێستا بەڵێن بدەم

ئەمە هەناسەی دوایی بێ.

## ( تەمەنی زیادە )

ڕەنگە نەتوانم دوای تۆ

خۆشەویستیەکی تر دروستکەمەوە

دڵنیاشم لەوەی ناتوانم

جارێکی تر بە تۆ بگەمەوە

لەم دنیایە شتێک شک نابەم

زامی ئەم دابڕانە سارێژکا

بۆیە هەمیشە وێڵم

بەدوای شتێکا سەرم گێژکا

حەز ئەکەم هەمیشە مەست بم

بە دووربم لە بەئاگایی

لەبەر دەمتا خۆم دەکوشت

گەر بم زانیایە هێندە سەختە جودایی

لەو ڕۆژەوە گوڵم

عومری خۆشەویستیمان کۆتایی هات

هەست دەکەم لە زیادە ئەژیم

لە زیادە تەمەنم دەڕوات.





## ( ئەوینی درۆ )

تۆش ڕۆیشتی

تۆش کۆتایت هات

ئەتۆش نەت هێشت

دڵم بە ئاوات بگات

تۆش لەسەر دڵم

بویتە برین

سوکایەتیت کرد

بە ئەوین

ئەوینت

لەمانا خاڵی کرد

عەشقی ئەمجارەش

بەمناڵی مرد

بڕۆ تۆش

بۆناو فەرهەنگی خەمی من

شەرم مەکە

پڕە لەکچانی وەک تۆدرۆزن.

## ( پەشیمانی )

گەر ئەمزانی خۆری چاوت

لەشەوە زەنگی روحی منا هەڵنایە

گەر دەمزانی لە دڵتا جێی نابێ

ئەو هەستەی لە دڵی مندایە

لەشەوە زەنگی چاوەروانی

خۆری چاوەکانتا خۆم نەدەکوشت

دڵی شێتم بۆت بەرەڵا نەدەکرد و

هەستی پاکم بۆت هەڵنەدەرشت

گەر دەمزانی سپێدەی خۆشەویستی

لەشەوی بەختی منا مردووە

ئەو کەسە بێ سۆزە

کەهەستی منی داگیر کردوە

نەم دەهێشت شەوی بەختم

لە چاوەروانی سپێدەی خۆشەویستیتا کاڵ بێتەوە

مۆمی رووناکی هەستم

لەژێر سایەی بێ روحمیتا بکوژێتەوە





گەر دەمزانی ئەم دڵەی تۆ

چاوی بەشیعر هەڵنایە

فەرهەنگی خۆشەویستی

لای ئەو بێ نرخ وبەهایە

ئەو هەڵەیەم نەدەکرد

شیعرم بۆودڵەت نەدەنوسی

نەم دەکردیتە هاودەمی

فەرهەنگی عەشقێکی برسی

گەر دەمزانی  جیهانی عەشق

لای تۆ تێکشکان وتاوانە

ولاَمی دەریایەک هەستی پاک

دنیایەک فرمێسک و ژانە

نەدەهاتمە لات و

جیهانی عەشقم پێت نەدەناساند

رێژنەی پرسیاری هەستم

بە وەلاَمی بێ هیوا نەدەتاساند







گەر دەمزانی دەروازەی دڵت

بە رق و کینە داخراوە

عەشق لای تۆ مۆدێلە

کۆن بووە باوی نەماوە

نەم دەهێشت پەنجەی شیعرم

لە دەرگای دڵت بدا

رێگەم نەئەدا زمانم

بە ئاوازی عەشق بانگت بکا

گەر دەمزانی زمانی شیعری ناسک

لای تۆ بێگانەیە و تێیناگەی

ڕەقی دڵت

بە هەموو ناسکی دنیا نادەی

پرچەکانتم

بە شیعر نەئەهۆنینەوە

نەم دەووت وەرە

با ناسکی و رەقی بگۆڕینەوە





گەر دەمزانی تۆز وغوباری شکست

بەر پەنجەرەی دڵتی تەنیوە

گوڵی هیوادەمێکە

تیایا ژاکاوە وەریوە

لە پەنجەرەی دڵتەوە

بۆ ئاسۆ نەم دەروانی

لە بیابانی دڵتا نەدەگەڕام

بۆ گوڵی کامەرانی

گەر دەمزانی رێژنەی بارانی سۆزم

خاکی بورەی دڵت نەرم ناکا

کەردەمزانی بەرد

لە زمانی شیرینی ئاو ناگا

بارانی حەز و تاسەم

بەسەر دڵتا نەدەباراند

تاڤگەی سۆز و خۆشەویستیم

بەسەر باڵاتا نەدەرژاند

گەر دەمزانی

ڕەشبینی بەدبینی

خۆپەرستی نازانی بدوێ

نەم دەهێشت

ببیەتە دڕکی خەم و

لە دڵی سۆزما بڕوێ.





( **پەستی** )

کاتێ دەگەمە

ئەوپەڕی پەستی

حەزناکەم

پەنا بەرم بۆ مەستی

نەکا ئەو خەمەی

بە ئەمانەت پێت سپاردوم

گلەیی بکا وبڵێ

ساتێ نەی دواندوم.







**( دووری )**

**بمبورە**

**کە دڵم لە دڵت**

**چاوم لە چاوت دوورە**

**بمبورە**

**کە نێوانمان ئێستا هەمووی سنورە**

**بمبورە کە تۆش**

**ئێستا وەک من بیٚ هیوای**

**ئێستا تۆش**

**کپ وبێدەنگی و تەنیای**

**خودایە تۆش بمبورە**

**لە هەموو شتێک**





**لە خۆشەویستی**

**بیٚ سنوری کچێک.**

**( شیعرەکانم )**

**بۆیە شیعرەکانم**

**زادەی سۆزێکن**

**چونکە زۆر بەیان**

**کۆرپەی شۆخێکن**

**شۆخێک بوو**

**چرکەکانی تەمەنمی لێکدا**

**هەر ئەویش بوو هات**

**ژیانمی تێکدا.**







**( چی؟ )**

باشە چی دەبوو

گەر ژیان ڕێگەی بدایە

ئەو دوو دڵە پر سۆزەمان

بەیەکتر شاد بونایە

چی کەم دەبۆوە

لە ئەرز و ئاسمان

تۆ لەگەڵما بای

لەم سەفەرەی ژیان

دەزانم چی بوو وایکرد





خودا ئەم کارە نەکا

خەریک بوو ئەمپەرستی

بۆیە تۆی بە من نەدا.

**( هەرشیعر )**

لەکاتی خەم و خەفەتا

لە شەوانی پڕ ئازار و مەینەتا

ئەو ساتانەی کە ناسۆری داگیرم دەکا

کە ژیان دەم ڕەنجێنێ و زویرم دەکا

ئەو کاتەی تۆ دەرژێیتە ناو خەیاڵم

لەو دەمەی دا کە زۆر زۆر بێ حاڵم

ئەو کاتەی لە دەست خەم هەراسانم

کە پڕ دەبن لە فرمێسک چاوەکانم

ئەو کاتەی لەنائومێدیدا گێژوهێژم

تەنها شیعرم هەیە داخی خۆمی پێ بڕێژم

تەنها شیعر لەو کاتانەدا هاو دەممە

هەر ئەو بەوەفایە و شەریکی خەممە

خودایە قەت شیعرم لێنەستێنی

دڵی ئەو هاوخەمەم لێ نەرەنجێنی

گەر شیعر نەبێ کوا بەرگەی ئەو دڵەت دەگرم

شیعر نەبێ هەموو شەوێ لەخەمی تۆ جارێ دەمرم.

**( سۆزی بێ تۆیی )**

کە شەو دادێت

من و چەند وێنەیەکت کۆڕ دەگرین

بەدیار گێرانەوەی رابردوو

تێر بۆیەک دەگرین

وێنەکانت لەناو

دەفتەری هۆنراوەکانما دەخەوێنم

هەرکاتێ بیرم کردیت

یەکە یەکە هەڵیان دەستێنم





سالآنێکە دەتنوسمەوە

لە نوسینەوەت تێر نابم

سەدان دێرم بۆ دابران نوسی

هەرچەند دەکەم لێی فێر نابم

دەرسی دابران گەلێ گرانە

مێشکم بەرگەی ناگرێ

هێندە بەدڵ خۆشم ویستوی

قەت عەشقت لە دڵما نامرێ

هەرچەند هەوڵ دەدەم

خۆم رابێنم لەگەڵ دابران

بێسودە فێری نابم

ئەو قەدەرە سەختەی ژیان

هەرچەند دەکەم ناتوانم

خوو بەکەسێکی ترەوە بگرم

چەند جارێ هەوڵمدا بێ

هەستم کردووە خەریکە بمرم

بڕوا بکە گوڵم ناتوانم

کەس جێگەی تۆ ناگرێتەوە

خۆشەویستیت لە ڕوحمایە

لە خوێنمایە جیاناکرێتەوە

چی لەم دنیایەدا هەیە

بەقەد وێنەیەکی تۆ خۆشم ناوێ

نیگای هیچ کچێ ناتوانێ

داگیرم بکا بۆ تەنها تاوێ

خۆتۆ وات ڕاهێناوم

کە کەسی ترم خۆشنەوێ

ئیتر گلەیی چیم لێدەکەی

کە هیچم بەردڵ نەکەوێ

بەڵێنم داوە ئیتر

خۆشەویستی ناکەم تا دەمرم

گەر لەتۆش نائومێد بووم

وێنەیەکت مارە دەبڕم

حەز ئەکەم خۆشم نەوێی

بەلأم چی بکەم ناتوانم

بە تۆ ڕاهاتوم

لە زمانی کەسی تر نازانم

ئاخ لە وێنەکانت هەمیشە

بە بێدەنگی بەرامبەرم ڕائەوەستن

واهەست ئەکەم ئەوانیش

وەکو تۆ لەمن پەستن

دادەنیشم بەرانبەریان





زۆر بە دڵ تێم رادەمێنن

کەچی بۆ تەنها چرکەیەک

دەروازەی بێ دەنگی ناشکێنن

پێم بڵێ چۆن توانیت

ئەو هەموو خۆشەویستیەی دڵت دەرکەی

چۆن ویژدانت ڕێگەی دای

بێ من بڕۆی سەفەر کەی

با منیش فێر بم

چۆن لە دڵی خۆمت دەرکەم

با فێربم گوێ نەدەم

بە ئازاری دووری و خەم

پێم بڵێ با بزانم

چۆن جارێکی تر عاشق ببمەوە

فێرم کە چۆن

خۆت فێرکرد بیرت بچمەوە

زیاد لە پێویست خۆشم ویستی

بۆیە ئاوام بەسەر هات

سنور نەمابوو دەمزانی

ئەو عەشقە سەرم دەخوات

تۆ دەڵێی لە بیرم کە
پێم بڵێ چۆن لە بیرت کەم
کە تۆ بەشێک بی لە دڵم
چۆن بتوانم زویرت کەم
چۆن لە بیرکەم ئەو ڕۆژانەی
بەشێک بووی لە هەناسەم
یا ئەو ساتانەی تەنها تۆ بوی
ناونیشان و پێناسەم
چۆن ئەونیگایانە لە بیر کەم
کە ئێواران چاومیان پر دەکرد
یا ئەو جووتە لێوەت گوڵم
کە تەنها ناوی منیان دەبرد

چۆن ناوی تۆ لە بیرکەم
کەلەسەر دڵم نوسرابێ
یا داستانێ خۆشەویستی
کە ژیانم بە ئەووەوە مابێ
چۆن ئەو ئێوارانە لەبیر کەم
کە لە هەست و سۆزت دەگرتم
یا ئەو ژوانە شیرینانەی





لێیانەوە فێری شیعرت کردم
دڵم ڕێگەم نادا گوڵم
هەرگیز ئەم بریارە بدەم
دڵنیابە دڵنیابە ناتوانم
بۆ چرکەیەک لەبیرت کەم
هەرچەند تۆ بریار بدەی
لێرە بەدوا منت نەوێ
هیچ لە دڵم ناگۆرێ
تادێ زیاتر تۆم خۆش دەوێ
تامردن چاوەروانم کەی
ئەو بریارەم لێ نابیستی
بەڵام بزانە یەکێ هەبوو
لەخۆت زیاتر خۆشی دەویستی.

**( ئێوارەی شار )**

ئێوارەیە بەقەد باڵای
تەنیایی خۆم بیرت دەکەم
لەناو دووکەڵی جگەرەیەکا
گێژ دەخۆم پرم لە خەو
هەر ئێوارەیەک تەنیابم
ژانی بێ تۆیی دڵم پر دەکا
دەریای هەستم دەشێوێ







بەرەو کەناری خەم شەپۆل ئەدا

ئێواران لە هەموو کات زیاتر

دەروونم بۆ تۆ گڕ دەگرێ

هێندە غوربەتیم هەڵدەستێ

فرمێسک فرمێسکم دەسڕێ

ئێواران هێندە بێزارم

ڕقم هەڵدەستێ لە ئێوارە

دەڵێم خۆزگە ئێوارەی تیا نەدەبوو

ڕۆژەکانی ئەم شارە

لە ئێوارەیەکا تۆم ناسی

ئێوارەش بوو بارگەت پێچایەوە

بەڵام واسەدان ئێوارە هاتەوە

کەچی تۆ هەرنەگەڕایەوە.

132

## ( تۆ لەهەستمای )

دەمێکە وونی

دەمێکە لە سۆزی دڵم دووری

ئێستا نایی بە دیدارێک

لێم کەیتەوە دەرگای سەبوری

هەرگیز ناڵێم ئەوە تۆی

منت ئاوا بیر چۆتەوە





عەشقی من لەگەڵ خوێنتا بوو

ئێستا چۆن بۆت جیابۆتەوە

من و تۆ دوو ڕەنگ بووین

لەناو فنجانی عەشقێکا گیرا بوینەوە

سەرم سورماوە لە قەدەر

چۆن بۆی لەیەک جیا بوینەوە

لەسەر تۆ گەنجیم دانا

کوا کوێم لەگەنج دەچێ؟

خۆم پیر کرد هەر بۆ ئەوەی

ئازیز گیان منت بیرنەچێ

مەهێڵە چیتر دووریت

دەریای هەستم ئازار بدات

تۆم لەناویا داناوە

نەبا ئازار بە تۆش بگات.

## ( شەوەسورەکان )

کە شەو دادێت

دەستم دەنێمە

کەمەری قەڵەمێکی برسی

بە هەموو هێزی پەنجەکانم

دەی گوشم

تاشیعرێکت بۆ بنوسی

تۆش مەستی بادەی

شەوە سورەکانی بەبێ ترسی

ئیتر چ باکتە تا بێی

لە خەمی من وقەڵەمێکی برسی بپرسی؟

چی بنوسم

کە شەوانی تۆ پڕ لە قاقاو

شەوانی من پر لە خەمە

چی بنوسم

کە ئاسمانی تۆ پر ئەستێرەو

ئاسمانی من پڕ لە تەمە

ئاخر گوڵم چۆن بتوانم

شەوانە شیعری ناسکت بۆ بچڕم

کە هەمیشە دوعام ئەوە بێ

لە دووری تۆ خوایە بمرم.

## ( خۆشەویستیت کۆتایی نایە ).

**زۆر جار ویستومە بت نوسمەوە**

**چۆن دەست پێ بکەم**

**دەم ووت لە توانای من بەدەرە**

**نەم دەتوانی ئەم بریارە بدەم**

**وا ئەمشەو لەگەڵ دەفتەرەکەم**





**کەوتوینەتە گفتوگۆ**

**لە نووکەوە دەینوسمەوە**

**بەسەر هاتی خۆشەویستی تۆ**

**سوپاس بۆ تۆ**

**کە فێری زۆر شتت کردم**

**بویتە مامۆستایەک**

**بەرەو زۆر کونجی خەم دەستت گرتم**

**فێرت کردم**

**ژیان بەرمەسەر لەگەڵ تەنیایی**

**فێرت کردم**

**خەم لەلام ببێتە شتێکی ئاسایی**

لەبیرت دێ ئەو رۆژەی بۆ یەکەم جار

خۆشەویستیم لای تۆ درکان

خۆزگە جارێکی تر دوبارە دەبۆوە

ئەو رۆژە خۆشەی ژیان

شەو لەبەرچاوم وێنەی ئەو ساتە

وەک بروسکە دەهات و دەچوو







هەستم دەکرد لەناو تاریکی ژورەکەما

نیگای تۆ وەک مۆم هەڵدەبوو

ئەو شەوە تێنەدەپەڕی

درێژتر بوو لە شەوی یەڵداش

خوام خوام بوو رۆژ بێتەوە

تا بێمە لات و بڵێم بەیانیت باش

بەیانی باشێکی ئەوکاتە

هەزار دەرد و بەڵای لادەبرد

سەدان برینم لە دڵما

بە خەندەیەک سارێژت دەکرد

زمانی ئەو کاتەمان

تەنها پێکەنین بوو

شتێ نەبوو ناوی خەم بێ

هەمووی باسی هیوای ژین بوو

جێ ژوانەکانتم هەمووی لە بیرە

ووتە شیرینەکانت لە گوێما دەزرنگێنەوە

نیگاکانت ئێستاش لە چاومان

بە فرمێسکیش ناتوێتەوە

ئەو ئێوارەیەم قەت بیر ناچێ





کە ووتت بمبورە سەفەر دەکەم

ماوەیەک ناتوانم بێمە لات

منیش ووتم ئەگەر وابێ

لەوانەیە ژیان بوەستێ

تا دێیتەوە ئەویش نەڕوات

ووتت ئارام بگرە

ئەزانم گەلێ گرانە دووری

چەند وێنەیەکت بۆم هێنابوو

ووتت بالات بن بۆ سەبوری

لە بیرمە ئەو کاتە تا هاتیەوە

من لە ماڵ نەهاتمە دەر

ئیتر لەو رۆژەوە من

رقم دەبێتەوە لەسەفەر

باش لە بیرمە کە هاتیتەوە

مستیلەیەکی زیوت هێنا بوو بۆم

ئیتر لەو ڕۆژەوە بە خەیاڵ

تۆم مارە برِی لە خۆم

دواتر پێم ووتی تو خوا سەفەر مەکە

با چیتر خەم نەخۆم بۆت

یا ئەگەر سەفەریشت کرد

دەبیٚ من بەری لەگەڵ خۆت

تۆش بەڵێنتدا کە ئیتر

هەرگیز لێم دوور نەبی

بەبیٚ من سەفەر نەکەی

بۆ هیچ کویٚ نەچی

هێندە خۆشم ئەویستی

زۆرجار دڵپیسم دەکرد لێت

گومانم دەکرد

لە دار و بەردی سەر ڕێت

بە جۆریٚ خۆشم دەویستی

ژیانم لە تۆدا دەبینی

پڕ بووی لە هەناسەی ئومێد

گیانە پڕبووی لەگەشبینی

\

لە بیرمە ئەو ئێوارەی دەستت گرتم

یەکەم جار بوو دەستت بەر دەستم کەویٚ

ووتت توخوا بە راستی پێم بڵیٚ

منت بە قەد چی خۆش دەویٚ

ووتم هێندەی خۆتت خۆش دەویٚ و





هێندەی خۆمم خۆ شدەویٚ

ووتم نازانم بە قەد چی

ئەوەندەی کە خۆت دەتەویٚ

ووتم زیاتریشە

ئەو خۆشەویستیەی من بۆ تۆ هەمە

هەستم کرد هێشتا پێت کەمە

بۆیە ووتم ئەوەندە هیچ نییە

ئەوە کەی پێوانەی خۆشەویستیە

بمبورە کە نەمتوانی ئەو کاتە

بەدڵی خۆت وولاٚمت بدەمەوە

ئەم گرێیە لە دڵتا بکەمەوە

ئێستا دەزانم گەر دەتەویٚ

بیٚ دوو دڵی پێت دەڵێم

هێندەی شیعر تۆم خۆشدەویٚ

هەناسەکەم زۆرن ئەو رۆژانەی

لەگەڵ تۆ بەسەرم بردن

زۆرن ئەو ساتە زێڕینانەی

لە خۆشەویستیەوە لە دایک بوون و

لە دابڕانێکا مردن

زۆرن ئەو بیرەوەریانەی

ئێستا لەناو روحمدا دێن و دەچن

یا ئەو یادگاریە شیرینانەی

وەک دیاری بە خشیوتن بەمن

زۆر جار دەڵێم دوای تۆ بمرم

دوای تۆ ژیان ئەوە ناهێنێ

بەدەستم بێ هەموو تەمەنم

ئەکەمە قوربانی ساتێکی دوێنێ

ئەو ساتەی یەکەم نیگات هاویشتە دڵم

ئیتر دوای ئەو من هەر قابیلی گڵم

بۆیە هەمیشە دوعا دەکەم

تەمەنم بەرەو دواوە بگەڕێتەوە

تابەر لەوەی بمرم جارێکی تر

دڵم بە دڵت شاد بێتەوە

شێت دەبم کە ئەو ئێوارەیەم بیر دێتەوە

کە ووتت دەستت بێنە دێڕێکت بۆ دەنوسم





ووتت ئێستا پێت دەڵێم چۆن دەبێ چارەنوسم

منیش وەک جاران دەستم دایتێ

زۆر حەزم دەکرد دەستم بەر دەستت کەوێ

وامزانی وەک جاران

بۆم لەسەر دەنوسی تۆم خۆش دەوێ

بەڵام چی ببینم خۆزگە ئەو دێرەم نەدیبا

خۆزگە دەستم نەدەیایتێ و لێت نەنوسیبا

کەلەسەر دەستم نوسیت بە تۆ ناگەم

ئەو قسەیەم بیرهاتەوە کە زۆر جار دەت ووت

سوێند بەخوا دوای تۆ دڵ بەکەس نادەم

بمبورە کە ئەو کاتە تورە بووم

بۆم دەرکەوت کە ڕاستگۆ بووی

بەناچاری ڕەنجەڕۆ بووی

تێگەیشتم کە تۆ هەرگیز درۆ ناکەی

خاوەن بەڵێنی دڵ بەکەس نادەی

ئەزانم خاوەن هەستێکی گەورە بوی

بەڵام ئەسەف ئەسەف بە فیرۆ چووی

لەو رۆژەوە هەست دەکەم

تەواو گۆڕاوم

ئەوەی بمبینێ

دەزانێ مرۆڤێکی دۆڕاوم

ئاسەواری ئەو عەشقە

زۆر پێمەوە دیارە

بۆیە روخسارم هەمیشە

مات و شێواو خەمبارە

تۆ رۆیشتی و

بە ناچاری منت جێهێشت

بمبورە

زۆرت ئازار لە پێناوی منداچێشت

زۆر شەوانە گریاندومی

خەوم لێزڕاندی

زۆرم خەم پێدای

فرمێسکی زۆرم پێ ڕژاندی

سالآنێک بە خۆشەویستی خۆمەوە

گیرۆدەم کردی

لێت نەگەرام بەبێ ئەنجام

عەیامێ دڵم بردی

بمبورە گەر رۆژانێ





پەیوەست بوویت پێمەوە

بە شێوەیێ خۆشت ویستبم

نەتتوانی بێ دوور بی لێمەوە

رەنگە ئەو دڵە بچکۆلەیەت

بەرگەی ئەم کۆستە نەگرێ

رەنگە ئێستا تۆش وەک من

فرمێسک لە چاوت نەبرێ

رەنگە ئێستا لەسوچێکی ژورەکەتدا

دەستت نابێتە ژێر چەناگەت و

خەمێک مەستی کردبی

چاوت بڕیبێتە کیلۆنی دەرگاکەت و

خەیاڵی هاتنی شیعرێک

ئارامی لێ هەڵگرتبی

دەزانم هەمیشە

چاوەڕێی میوانێکی

دەرت بێنێلەم دڵتەنگیەدا

چاوەرێی فرمێسکێکی پڕ لە هیوای

بت دوێنێ

لەم بێ دەنگیەدا

زۆر شەوانە بەیەکەوە







چاومان دەبڕیە ئاسمان

بۆ دۆزینەوەی ئەستێرەی خۆمان

دەکەوتینە گەڕان

هەر جووتە ئەستێرەیەکمان دەبینی

دەمان ووت ئەوە ئێمەین

دەمان ووت هەر بۆیەک دەبین

ئەوەتا لە ئاسمانیش پێکەوەین

لێرە بەدوا

لە ئەستێرەو ئاسمانا بۆمن مەگەڕێ

چاوەڕێی دەرگاکەت مەکە

من لێوەی بێمە ژووری

لێرە بەدوا

لەناو دڵ و خەیاڵتا بۆ من مەگەڕێ

چاوەڕێ مەکە ببمە فرمێسک و

لەچاوتا بێمە دەرێ

بەیانیان بە دوامامەگەڕێ

کاتێ کە بینیت خۆر هەڵهات

ئێوارانیش چاوەڕێم مەکە

ئیتر ناتوانم بێمە لات

کە منت ویست





ئێستا من بوومەتە چەپکێ هۆنراوە

لەناو دووتوێی کتێبێکا

خۆم حەشار داوە

لای کەس مەی درکێنە

با نەزانن ئەو شیعرانە منم

باهەمیشە وا بزانن

من لەلات وونم

نەبادا جارێکی تر

دڵم بشکێنن

لەبەرچاوی تۆ

بم درێنن بم ڕوخێنن

ئیتر شەوانە

شیعر بدوێنە

لەباوەشیان بگرە

لەگەڵ خۆتا بیان خەوێنە

ئێستا منیش کە تۆم ویست

وێنەکانت ئەدوێنم

لەباوەشیان دەگرم

لەگەڵ خۆما دەیان خەوێنم

منیش ئێستا وەک تۆ

چوومەتە ناو کەژاوەی زێڕینەوە

منیش چوومەتە

ناو ژیانی ئەڵقە گۆڕینەوە

بەڵام من وەک تۆ

پەنجەم بەکەس نەبەخشیوە

ئەمێستاکە وێنەیەکی تۆم

لەخۆم مارەبڕیوە

ئێستا وێنەیەکت بوەتە

بوکی ماڵە بێ دەنگەکەم

رۆژگاری تاڵ و تفت

لەگەڵ ئەوا بەڕێ دەکەم

تۆشم لەچاوما هەڵگرتوە

دنیا لە پشتی تۆوە دەبینم

بمبورە کە زوو زوو

تەڕت دەکەم بە ئەسرینم

خۆ حەز ناکەم بگریم

دەڵێم نەکا شێوەت لە چاوما هەڵوەرێ

بەڵام چی بکەم دڵم ناتوانێ

تەنها شەوێک بێ گریان بباتە سەرێ





دڵم زۆر بێزارم دەکا

کە شەوانە تۆی بیردێتەوە

هەزار بەڵێنی درۆی پێدەدەم

بە هیچ بۆم ناژیرێتەوە

نازانم بۆ ئەوەندە

بە داوی عەشقی تۆ ئەسیرە

بروا بکە منیشی بیر بچێ

تۆی هەر لە بیرە هەر لە بیرە

زۆر خەم بۆ ئەوە دەخۆم

دەترسم تۆش وەک من بی

دەترسم شەوانە تۆش

لەناو دەریای خەما وون بی

چونکە سەردەمانی پێکەوە بوون

من دەم ووت چۆنم تۆش دەت ووت وام

دەت ووت لە هەموو شتێکا

لەیەک دەچین من دڵنیام

بەیەکەوە دڵتەنگ دەبووین

بەیەکەوە دەگریاین و پێ دەکەنین

زۆر جار دەمانووت دەڵێی

بەیەک هەناسەو دڵ دەژین







بۆیە ئێستا دەترسم

حاڵی تۆش وەک من بێ

ژیانی تۆش وەک من

هەمووی مردن بێ

من و تۆ وەک گەڵا و درەخت

گەیشتین بە خەزانێ

تازە من گەڵای بەختم

بۆ باڵای درەختێ نارِوانێ

بە ئومێدم تۆ

رێگایەکی نوێ بگریتەوە

باڵاکەی گەڵاکەی

سەوز بیتەوە

ببورە گەر شەوانە بێزارت دەکەم

دێمە ناو خەیاڵتەوە

یا هاتومەتە ناو رۆژمێری

خەمی مانگ و ساڵتەوە

ببورە گەر

کات لە بیرکردنەوەت بگرم

هیوادارم خەمم بۆ نەخۆی

من لەناو دڵتا بمرم

148





تۆ زۆر لەوە گەورەتری

کە بیر لەمن بکەیتەوە

ئومێد دەکەم بەختەوەر بی

من لە بیر خۆت ببەیتەوە

چەندێکە لێت دوورم

بەهەر چرکەیەکا

هەزار سڵاوت بۆ دەنێرم

خۆم بەخەم و تەنیایی و

تۆش

بە بەختەوەری دەسپێرم.

## ( سۆزی ماڵئاوایی )

وا دەڕۆم گوڵم

لێرە بەدوا بە تەنیایت دەسپێرم

بۆ ووتە شیرینەکانت

ئیتر ناتوانم گوێ رادێرم

لەگەڵ تۆدا خۆشم دەسپێرم

بە تەنیایی و دووری و خەم

ئیتر قەدەر ڕێ نادات

ئێواران دەست لە دەستت کەم

هیچ بە شایستەی ئەوە نازانم

پێت ببەخشم لەگەڵ ماڵئاوایی

جگەلە چەند ووشەیەک

با لات بن بۆ تەنیایی

گەر هات و بیرت کردم

توخوا با خەم  داتنەگرێ

مەهێڵە قەت دڵتەنگ بی

باشادی لە دڵتا نەمرێ

بمبەخشە نەکا قەدەر

ڕێ نەدا بتبینمەوە

کە مردیشم با ناوی تۆ

بێتە ناو تەڵقینەوە.





## ( دابڕان )

ئەمشەو لە کونجێکی ژوورەکەمدا

پرسە دای گرتووم

لەناو دەریای یادی تۆدا

خەیاڵ نغرۆی خەمی کردووم

دەمزانی کە تۆم نەمێنی

توشم دەبێ بەم ساتەوە

دابرانت یەخەم پێدەگرێ

خۆی لە بیرم ناباتەوە

گوڵم وەک تۆ پەرێشانی

ئێستا منیش دەربەدەرم

تۆم نەمای بۆ شەوانی ئەندێشە

ئێستا هانا بۆ کێ بەرم

وەک خەمی تۆ دڵی پر کردووم

با خەمی من دڵت پڕ نەکا

چارەنوسی ژیان ئاوا بوو

کە دڵی من بە تۆ نەگا

من لەناو دڵتا توامەوە

لە بیری خۆتم بەرەوە

گەر بیری منت کرد ئەوا

پەڕەی شیعرێ هەڵدەرەوە

ئیتر ژوان لەگەڵ شیعر ببەستە

لە جێی من شیعر بدوێنە

وەک جاران منت دەتاساند

ئێستا بە ماچ ئەو بتاسێنە

لە تۆوە فێری شیعر بووم

هەموشیانت بۆ دەنێرمەوە

تائەشمرم سۆزی تۆ

وا بەوێنەی ووشەو دێڕمەوە

کە تۆم خۆش ویست

لەچاوانتابەهەشتم ئەدی

نەمزانی قەدەر لێتم دەکا

ناتبینمەوە بۆ ئەبەدی.





## ( هەردێمەوە ناودڵت )

بمبورە ئێستا ناتوانم

وەک جاران فرمێسکەکانت بخۆمەوە

لێناگەرێن پەڵەی خەمی دڵەکەم

بە ئاورنگی پەڕەی کوڵمت بشۆمەوە

ئێستا ناگەم هەموو شەوێ

بێمە لات لەگەڵ شیعرێکی شێت

ئێستا لەوە گەورەتری

دڵم کەمە ڕاخەری پێت

سنوری عەشق لێرە دژوارە

ڕێگایەک نەماوە بۆ پێک گەیشتن

ووشەکانی خۆشەویستی مردون

پەیڤێک نەماوە بۆ تێک گەیشتن

بۆ ئەو دڵەی تیایدا گەورە بوم

هەر لە دڵمایە بڕۆمەوە

بەڵام بمبورە ئێستا ناتوانم







فرمێسکەکانت بخۆمەوە.

**( هەڵەبووم )**

من ووتم بایەکتر لە بیرکەین

خۆمن تۆم بیر ناچێتەوە

من ئەو هەڵەیەم بە تۆ کرد

ئاهی تۆ لە گەردنم نابێتەوە

بمبورە خۆمن ئێستا

سەد هێندەی تۆ بێ قەرارم

گەرجاران تۆم خۆش ویستبێ

ئێستا وێنەیەکت بوەتە چرای شەوگارم

قوربانی ئەو فرمێسکانەت بم

کە لەداخی بێ منی دەیان ڕێژی

بمرم بۆ ئەو هەناسە ساردانەت

کە بۆمن هەڵیان دەکێشی

بە قوربانی ئەو خەیاڵەت بم

کە یادی من میوانی ئەندێشەتە





بۆت شێت بم ئەی ئەو دەریایەی

تەنها دووری من کێشەتە.

**( بعیدعنك )**

ئێوارەیە و

تەم بەرپەنجەرەی دڵمی گرتووە

بۆ ئاوازی ووردە باران

بەهێمنی گوێم شل کردووە

وەک ئەو ئێوارە باراناویانەی

چاوەڕێم دەکردی

کە دەهاتی هەر بەتەڕی

لە باوەشم دەگرتی

تادەگەیشتیە لام

باران زۆر ئازاری ئەدای

ئەم ووت کە دەتزانی بارانە

نەدەبوو هاتبای

تۆش دەت ووت

ئاخر بەڵێنم دابوو بۆیە هاتم

دەنا لێرە بم یالەوێ

بەخەیاڵ هەر لەلاتم

چاوم لێت بوو جار جار

بەموچرکی سەرما دەلەرزێتەوە

منیش وەک باڵندەی تەڕبوو

بە کو کو گەرمم دەکردیتەوە

ئینجا بەشەرمەوە وەکو میوان

دادەنیشتی لەلامەوە

لەو کاتەوە نەم بینیبوی

هەموویت بۆ دەگێرامەوە

منیش قسەم نەدەکرد

هەردەم ووت بەڵێ خۆشەویستم

خوا خوام بوو وشیەک زیاتر

بەدەنگی تۆببیستم

بەدیار چەند ئاوازێکی شادو

گۆرانی هەستی عاشقانە

بەدەم قاقاو پێکەنینین و

گاڵتەو گەپی هەرزەکارانە

تەمەنێکمان بەڕێ دەکرد

بێ ئەوەی خەم پێ بزانێ

تێر دیاریمان دەگۆڕیەوە





تا درەنگی ئێوارانێ

ئیتر کە عومری ئەو رۆژە

بەرەو ئاوابوون دەچوو

تەمەنی ئەو هاتنەی تۆش

بە هێمنی تەواو دەبوو

ئێوارانی ئەو کاتەمان

ئاوەها بەرێ دەکرد

وەک ئێستا بۆ چرکە دیدارێ

هەزار سوجدەمان نەدەبرد

ئێستاش ئێوارەیە بەڵام

خۆزگە ئێوارەی وام نەدەدی

خۆ تەنیایی ژوورەکەمی

کردوۆتە زیندانێکی ئەبەدی

ئێستا بە دیار گۆرانی

(بعید عنک)ی ئوم کلسوم

دەنوسمەوە بیرەوەریەکانی

رۆژانی عەشقی رابردووم

ئێستا وەک ئەو کاتە نیم

فێربووم شیعر دەنوسم

گلەیی دەکەم لەو کەسەی

تێکی شکاند چارەنووسم

دوای تۆ شیعر بەڵێنی داوە

تا مردن لەگەڵما بێ

هەرچەندەناچاری نەبێ

قەت شیعر وەک تۆ نابێ

ئێستاش بە یادی جارانەوە

پەنجەرەکەم دەسڕم

لەبەردەمیا دەوەستم

دەڕوانم ئێشکە دەگرم

سەیرە قەت لە تۆ

لەبینینت بێ هیوا نابم

ئێستاش دەڵێم

دەبێ من هەر بۆ تۆ مابم

رەشبین نیم هەرچەند

تیشکی خۆرم لێ براوە

سەیرە ئومێدم

بە پرشنگی ئەستێرە ماوە

ناوت لە بیر و ئەندێشەما

مۆرێکە ناسرێتەوە

خۆشەویستیت خوێنە هەناسەیە





تا مابم نابڕێتەوە

ئێوارەیە بۆ خەمی دووریت

چاوم پڕ لە ئاوە

بیرت دەکەم

بە هەموو ئەو هەستەی خوا پێمی داوە.

**( عومرم دا بەنیگایێ )**

رۆژمێری تەمەنم

پرە لە دووری و چاوەروانی

ئەو تەمەنەی خوا پێی داوم

تۆ بەتاڵت کرد لە جوانی

ئەوەندە خەمم بۆ خواردی

گوڵم هاکا دڵم تەقی

روحی لاویمت کوشت

تۆ بەبێ دەنگی و دڵرەقی

لە ئێوارەیەکا توشم هات

تەمەنی کورتی نیگایێ

بە دڵێکی فراوانەوە

هەموو عومری خۆمم دایێ.

## ( نائومێدی )

قەت لە دڵم دەرناچی

بەوە نییە کە لێت زیزم

سەد بەهاریش بەسەرما بێ

من خەڵکی وەرزی پایزم

بەهارێ بووم سەوز سەوز

لەناو چاوتا زەرد هەڵگەرام

بۆیە ئێستا هەناسەکەم

ئەمبینی ئاوا بێ هیوام.





## ( شیعر پێناسەمە )

کە دابڕاین ووتم تەنها

یەک شیعرت بۆ دەنوسم

گوێی پێ نادەم لێڵی ناکەم

ئاسۆی ڕوونی چارەنوسم

کە ڕۆیشتی ووتم تەنها

یەک جار بۆت دەگریم و بەس

چونکە تا ئەوکاتە

نەیگریاندبووم کەس

ئەم ووت خۆشەویستی ئەوە ناهێنێ

زوو بیرم دەچێتەوە

ماوەیەک خەمی بۆ دەخۆم

کۆتایی دێ و دەبڕێتەوە

وتم لە خەیاڵما نامێنی

گەرماوەیێ نەتبینم

دڵم ئەدەم بە یەکێ تر

ئەیکەم بەهاوسەری ژینم

نەم دەزانی عەشقی تۆ

گەر لە ماڵی دڵم لاچێ

تازە جارێکی تر دڵم

بە کەسی ترا ناچێ

نەم ئەزانی گەر ئێواران لەگەڵتا

نەگۆڕمەوە گەرمە نیگایێ

وەک ئەوەی چاوم کوێر بێ

بە ڕووی ژیانا هەڵنایێ

نەم ئەزانی خۆشەویستیت

بۆ من بۆتە هەناسە





کە تۆ بڕۆی شیعر

بۆ من دەبێتە پێناسە

نەمدەزانی گەر بێ تۆ بم

خەم سەر و دڵم دەگرێ

پیر دەبم زویر دەبم

شێت ئەبم دڵم دەمرێ.

**(کارەسات)**

ووتی بڕۆ لێرە بەدوا

کۆتایی بە خۆشەویستیم بێنە

لە بیر خۆتم بەرەوە

هەرگیز ناوم مەهێنە

ووتی بڕۆ کەسێکی تر

بکە بەلانەی خەم

لە خەیاڵتا دەرم بێنە

وامەزانە کە من هەم

ووتی ئیتر حەز ناکەم

وەک جاران سەلام بکەی

گریمان هەر نامناسی
ئەبێ خۆت وا دەربخەی
ووتی هەرگیز نامەوێ
چیتر شیعرم بۆمەنوسە
بڵێم چی بۆیەک نابین
ئەوە خەتای چارەنوسە
ئیتر لەو رۆژەوە لەناو دڵما
ناسۆری و خەم چرۆ دەکات
خۆشەویستی لەلای من
بووەتە گەورەترین کارەسات.

## ( باکم نی یە )

گوڵی زەردم
واهەست نەکەی ئیتر نەمای
تۆ ئێستاکەش لە دڵما
گەورەترین موعجیزەی خودای
لەو رۆژەوە بریارم دا
دڵم دەمە دەستی کچێ
نیەتی ئەوەم هێناوە





وەک تیر بە دڵما بچێ
دڵنیابە باکم نیە
هێندەی تریش ئازارم دەی
بڵێم چی سروشتی خۆتە
ئاوا خۆشەویستی ئەکەی.

## ( دڵم نایە ئازارت دەم )

دڵم نایە
حاشا بکەم لێت
یەکێکی تر
لە جێی من خۆشەویستیت بێت
دڵیشم نایە ئازارت دەم
عەشقی نوێت لێ تاڵ کەم
دوای ئەو هەموو خۆشەویستیە

نامەوێ بت گریێنم
تەلاری تازەی بوکێنیت
هەرەس پێ بێنم
خۆزگە منیش وەک تۆ
تەواو دەگۆڕام
لە گرەوی خۆشەویستی
تەواو ئەدۆڕام
تاهێندە خەمم نەخواردبا
بۆ ڕۆژانی رابردوو
تاهێندە نەگریابام
بۆ تەرمی عەشقی بابردوو

خۆشم حەزناکەم هێندە
باسی کۆنت بیر بێنمەوە
نامەوێ جارێکی تر
ئەو عەشقە بروێنمەوە
بەڵام چی بکەم
بیرەوەریەکانت ئازارم ئەدەن
هەموو چرکەێی
لە خەیاڵما باست ئەکەن





یادەکانت
خۆیان دەدوێن
وەک چقڵ
لە دڵما دەروێن
زۆر جار دەمەوێ
لە خەیاڵی خۆمت دەرکەم
بەرگی ژیانی
عەشقێکی نوێ لەبەرکەم
بەڵام ناتوانم مەگەر
خۆشەویستیم تیا دەربێنن
هەست و سۆزی کەسێکی
وەک تۆم تیا بروێنن.

**( کەژاوەی بوکێنی )**

چیت پێ بڵێم
خۆ نازانم خۆ ناتوانم
لە ئاستی تۆ
بێ پەنجەم بێ زمانم
وەک تۆم پێناکرێ
ناتوانم ڕقم لێت بێ
هەرچۆنێ بی

ئەبێ ئومێدم پێت بێ

سوێند بەو تارایەی

بەسەرتا کرا

بەو کورسیەی

لە رۆژی بوکێنی بۆت دانرا

سوێند بەو ئەڵقەیەی

لە پەنجەت کرد

بەو خۆشەویستیەی

لە نێوانماندا مرد

سوێند بەو بەفرەی

بۆ شادی بەسەرتا باری

بەو جلی زەهرایەی

لێمی کردیت بە یەکجاری

سوێند بەو هەواڵەی

بۆم هات لەوێرا

بەو زەماوەند و ئاهەنگەی

بۆ تۆیان گێرا

سوێند بە دواین شەوی

تەمەنی کچێنیت

بەو کەسەی هاتە

ناو پەردەی بوکێنیت





سوێند بە ئاوازی

قاقا و پێکەنینت

بەیادگاری ئەوینی

تاڵ وشیرینت

سوێند بەو پەیمانەی

بۆ مردن بە منت دا

بەو عەشقەی

بووبە گەڵای بەربا

سوێند بەو شیعرانەی

ئەت ووت بۆم بنوسە

بەو بریارەی

ئێستا لای تۆ چارەنوسە

سوێند بەو چاوانەی

ئێستا بێ نازن

بەو دەست و مەچەکەی

ئێستا پڕن لە بازن

سوێند بە شەوانی

پڕ ئەندێشەی من

بە ژیانی نەهامەتی و

پر کێشەی من

سوێند بەو فرمێسکانەی

بۆ تۆیان ئەرێژم

بەو بادە تاڵ و تفتەی

بۆ تۆی ئەچێژم

سوێند بەو ساتانەی

مەست و بێ ئاگام

بەو پەیمان و بەڵێنەی

لەگەڵیا شکام

سوێند بە چارەنوس

بەقەدەری خوا

سوێند بەو تەمەنەی

بەبێ تۆ دەڕوا

هەرچەند خۆشی و شادی

لام ئاسەواری نەماوە

دڵم پر ئازارە و

لەسەد لاوە شکاوە

هەرچەند ئەو چاوانەی

بۆ عومرم چرا بوون

وەک خۆری ئێوارە





لێم ئاوا بوون

هەرچەند ئەو پەنجەیەی

قیبلەی من بوو

بەناوئەڵقەیەکی

ڕووزەرد داچوو

ناتوانم هیچت پێ بڵێم

قەت دڵم نایە

ئێستاش عەشقت

بۆ خاکی دڵم ئالآیە

گلەیی هیچت لێ ناکەم

بەخراپ ناوت نابەم

خۆشەویستی چاوێکت

بە دنیا نادەم

ئێستاش بە یادی تۆ

هەنگاو دەنێم

تا دەمرم بۆ تۆ

شیعر دەڵێم

ئێستاش بە بۆنەی تۆ

لەم ژیانە ئەژیم

هەموو شەوێ وەک مناڵ

بۆ دوریت ئەگریم

خەمەکانت وەک خۆت

شیرینن لام

تۆ مانگ و ئەستێرەی

بۆ شەوانی ژینی تەنیایم

ئێستاش تۆ شازادەی

لە وولاٚتی دلٚم

بۆ گوڵی ئاواتت

خاک و خۆڵ و گلٚم

ووشەی رەقم لیٚ نابیستی

هەروەکو لێت نەبیستوم

ئێستاش بەو رۆژانە ئەژیم

گیانەکەم کە خۆشت ویستوم.

## ( گۆڕی خۆشەویستی )

کە تۆم بیر دێتەوە

لەناو دوکەڵی جگەرەیەکا

خۆم لیٚ وون دەبیٚ

بەهیچ دلٚم بۆ ناژیریٚ

چونکە وەک جارانی تۆ دەچیٚ





فرمێسک هێدی هێدی

ئەکەونە سەر رووومەتی هەڵقرچاوم

بێزار دەبم لە هەموو شتیٚ

لەو ژینەش کە خوا پێی داوم

کە تۆم بیر دێتەوە

هەر لەناو دلٚما دەگەرێم

بەڵکو ئاسەوارێکی تۆی تیا مابیٚ

ئەڵێم بەڵکو گۆری

تەمەنێک سۆز و خۆشەویستی

لەناو دڵی شکاوما هەڵکەنرابیٚ.

## ( بیرەوەری)

زۆر ئێواران

سۆزی دلٚم رامدەکێشیٚ

پیاسەییٚ بەناو شەقامی

بیرەوەریەکانما بکەم

حەز ناکەم چیتر

به ئازاری یادی تۆ بتلێمەوە

بۆیە هەوڵ ئەدەم

لە بیرەوەریەکانی تۆ خۆم لابدەم

بەڵام هەر لاپەرەیەک

لە یادەوەری تەمەنم هەڵدەمەوە

وێنەی تۆی تیا دەردەکەوێ

ئەوسا تێدەگەم

لەوساتەوە لەدایک بووم

بێئەوەی زانیبێتم

دڵم تۆی خۆش دەوێ

دوو شوێن

قەت لەبیری دڵم ناچنەوە

کارەساتێکن

لەیادەوەریما کاڵ نابنەوە

ئەو شوێنەی کە بریارمان لێدا

دڵمان بەیەک بدەین

لەگەڵ ئەو شەقامەی

کە ماڵئاوایمان لەیەک کرد و

نەمان توانیەوە بەیەک بگەین

تۆ ڕۆییشتی لەگەڵ تەمەنێ یادگاری





منت لێرە بەجێهێشت

تەمەنێک ئازاری ئەوینداریت

بەناڕەوا بە من چێشت

زۆر جار بەڵێن ئەدەم

چیتر فرمێسکت بۆ نەرێژم

چیتر بادەی تاڵ و تفت

بۆخەمی دوریت نەچێژم

چیتر بە دووکەڵی جگەرە

ڕەنگی زەردم زەردتر نەکەم

لەدڵم دەرت دەکەم و

گوێ بە عەشقی دۆڕاوم نەدەم

بەڵام هەست دەکەم هەڵەم

کە بڕیار بدەم وازت لێبێنم

چونکە وەک ئەوەیە بڵێم

خوێنی دەمارەکانم دەردێنم

ئیتر دەزانم ناتوانم

تۆ لەبیر خۆم بەمەوە

بۆیە بەدڵێکی فراوانەوە

باوەش بۆ ئازارەکانت دەکەمەوە

بەڵام ئازیز نەکەی

تۆ خەم بۆمن بخۆی

قەدەر بۆکوێ دەستی گرتی

حەزدەکەم لەگەڵیا بڕۆی

گەر خەیاڵێکی من هات بەبیرتا

نەکەی فرمێسکی بۆ بڕێژی

من تۆم وا پەروەردە کردوە

فێر نەبووی تاڵی بچێژی

لەمن گەری با خەم

بادەی تەمەنم بخواتەوە

دڵنیام هێزی نییە

تۆم لەبیر بباتەوە

من بە نیەتی ئەوە عاشقت بووم

قەت خۆشەویستیت کاڵ نەبێتەوە

باوەرناکەم قەت شتێ هەبێ

لای من جێی تۆ بگرێتەوە.

لە بیرت دێ هەناسەکەم

رۆژێ وتت با تاقی کەینەوە

ئەگەر لەیەکتر دووربین

کاممان زیاتر بیری یەک دەکەین

ووتت ئاخۆ کاممان عاشقترین





کاممان زیاتر خۆشەویستی لەدڵدایە

ووتت وەرە باسێ ئێوارە

گفتی ژوان بە یەکتر نەدەین

ئەو کاتە نەوێرام گرەوت لەگەڵ کەم

چونکە پێم وابوو

سۆزی ئافرەت هێندە گەورەیە

پیاو لەناویا دەتوێتەوە

ئافرەت پڕە لە سۆز

ناشێ هەرگیز خۆشەویستی بیر بچێتەوە

ئەو کات نەم هێشت بۆ تاقیکردنەوەش

سێ ئێوارە لە یەکتر دوربین

کەچی قەدەر

وا بۆ ئەبەد لێکی کردین

ئازیز مادام ئەو رۆژە هات

کە ئەم ووت رەنگە بەرگەی نەگرم

مادام ئەو قەدەرە توشم بوو

کە ئەم ووت بیبینم ئەمرم

ئێستا ئەپرسم دەبێ کاممان

لەو تاقیکردنەوەیە دۆڕابین

ئەبێ کاممان

بەدڵ لەیەک تۆرابیین

لە کاتێکا من لە دوای تۆ

تەلاری ئاواتم رووخاوە

دڵم بۆتە لانەی خەم

لە ئازارا بۆتە کەلاوە

سەروبنی شیعرم

یادەوەری عەشقی تۆیە

لەوساتەوە تۆ رۆشیتوی

هەموو شتێ لەلام نامۆیە

بەڵام تۆ هەر بێ دەنگی

هیچ هەستێکن لانەماوە

بەرامبەر ئەو پەیمانەی

وا ساڵانێکە بە منت داوە.

## ( بێ ڕوحم )

جاران گەر رۆژێ نەتدیبام

نەتدەزانی خەمەکانت چۆن بە بادەی

کەچی ئیستا بە خەونیش

بوار بەدیدارێک نادەی





جاران ئەتووت بەبێ تۆ

رۆژم تێکەڵ بە شەو دەبێ

ئێستاش بەبێ من

شەوی تاریکت لە رۆژ دەچێ

جاران شیعرێکم بۆت دەنوسی

سەدجار خۆت دەکردە قوربانی

ئێستاش تۆم کردوە بە شیعر

ئەی بۆ هێدە بێ ویژدانی

ئێستا چاوی تۆ پرە لە ژیان

ژیانێک پر لە بەتاڵی

منیش بۆ ژەکی دڵت

لێوان لێوم لە مناڵی

جاران وەک مناڵ گڕوت دەگرت

بۆچرپەی ئێوارە ژوانێ

ئێستاش بەساڵ نامبینی

ناشپرسی لەکوێیەو کوانێ .

## ( ژانی دووری )

چۆن ئەتوانم

لەبیرت کەم و بۆت نەنوسم

کە بەچاوی تۆوە بەندبوو

هەموو ژیان و چارەنوسم







بەخشینی پەنجەیەکت پێم

ببوە خولیا و ئاواتم

بەخەیاڵی ئەو رۆیی

سەرتاپای عومری کاتم

زۆرم کرد تاقەدەر

دەرت نەکا لەلام

تا رۆژگارێ نەبینم

جێم بێڵێ بەبێ سەلام

زۆر لە خوا پارامەوە

پەنجەت بۆ ئەڵقەی من بێ

نەک ئێستا بۆ ئەڵقەیەک

بەئەوینی من دوژمن بێ

کەی ئەمزانی کاتژمێری ژیان

ئەو چرکە ساتەی تیایە

کەخۆشەویستی تیایدا

وەکو گەڵای بەربا وایە

کەی ئەمزانی لە تەمەنما

وەها رۆژێک دێ

سەرو بنی شیعرم

باسی خەم و خەفەت بێ

چی بکەم کە باسی تۆ بۆ خۆم و





خۆم بۆ تۆ نەکەم

بۆ کێ بدوێم کە کەس تێم نەگا

گوێ بۆ کێ بگرم کە لە کەس نەگەم

شەوانی تۆفانی خەم

بۆ کێ بگێرمەوە

کێ لە جێی تۆ

بێنمە ناو نوسین و دێرمەوە

چی لە دڵی شکاوم کەم

تا تاوێ تۆی بیرچێتەوە

تاکەی بە درۆ پێی بڵێم

چاوەرێبە هەر دێتەوە

هەناسەیەک نەماوە

لەدوای تۆ بۆ خۆشەویستی

لە ژانی دووری بەولاوە

چاوەرێی چیم لێ ببیستی.

## ( خۆشەویستیت رێم پێ نادا )

لەناو وێرانەی دڵی منا

کە هەناسەیەک بی بێ کۆتایی

چۆن بتوانم لێت وەرگرم

دواین ووتەی ماڵئاوایی

فرمێسکە مەستەکانی چاوم

ئێستاش بۆنی تۆیان لێدێ

چاوەڕێی چرپەیەکن

هەواڵی هاتنەوەتی پێ بێ

ئەو ڕۆژانەی خۆشت ویستوم

گەر ئێستاکە تۆ ڕقت لێت

توخوا بۆ منیان لێگەڕێ

ئومێدی هەموو دنیام پێن

ئەو شەقامەی ئێوارانی

لەگەڵ تۆ لێی وەستاوم

ئێستا هەر ئەو سەبورییە

بۆ دڵی تەنیا و جێماوم

گەر بڕیاری جیابوونەوە

لەلای تۆ دواین وتەیە

خۆشەویستیت ڕێم نادا

قبوڵی بکەم ئەم قسەیە

دڵت چۆن توانی ئازیز گیان

دڵم جێ بێڵێ و لای بڕوا

کە هێندە گەورەبووی لەلام

تەنها بچوکتربووی لە خوا





تۆ لەدڵم ڕوابوی

بەناخما چووبوویتە خوارێ

ئیتر چۆن توانیت سەفەرکەی

بەجێم بهێڵی بە جارێ.

**( دەدەرگەوە )**

دیسان خەم تێم ئالاَ

لە سوچێکا بە تەنێ

ڕێ لە تیشکی ئومێدم گیرا

خۆر لەگەڵما پێناکەنێ

دیسان دڵم دەیەوێ

گەردی ئازاری بە بادە بسڕم

بۆ وەرینی گوڵی ئاواتی

جارێکی تر پرسە دابگرم

پەنا بۆ کام شادی ڕابردوو بەرم

خەمی ئەمشەوم بیرباتەوە

لەم تەنیایی یەدا دەستی کێ بگرم

خەریکە خەم دەمخواتەوە

گلەیی بێ لێت ژیان

گلەیی بێ لە قەدەری ئەو خوایە

گلەیی بێ ئەی ئەو کەسەی

دەرگام بۆ خەمت والأیە

ئەی هەوێنی خەمم

سۆزی دڵت لە کوێیە فریام کەوێ

من لە تۆوە خەمم خۆش ویست

ئێستاش بە خەمەوە تۆم خۆش دەوێ

دەدەرکەوە لەگەڵ کاروانی خەمێ

یا لەگەڵ ئازاری بە سوێی زامێکا





یا لەگەڵ تارمایی شەوێ

یا لەگەڵ خۆری بەیانێکا

ڕەشەبای یادت نایەڵێ

چرۆی خەیاڵم بسرەوێ

لەم خەم و بێدارییەدا

دیسان فرمێسکی لێم دەوێ

لە کوێی دیسان لەبێ تۆییدا

ئازار ڕیشەی داکوتایەوە

ئەو هەموو سۆزەی نێوانمان

توخوا پێم بڵێ بەچی توایەوە.

**(دڵت منالێ بوو)**

شەو درەنگانێ

کە بەدیار شیعرێکەوە ئێشکە دەگرم

بیرەوەری یادێکت دەمباتەوە

بەناچاری بۆلای دەفرم

لە وێنەکانت ڕادەمێنم

چاوم پڕ دەبێ لە فرمێسک

بۆ رۆژانی رابردوو ئەگریم

وەکو منالّی ناو بێشک

لەو رۆژەوە وەکو گەلاّ

لەداری بالاّی تۆ وەریوم

جامی بەختم ئەو کاتە ڕژا

بۆیە ئێستا وا خێر نەدیوم

تاوانم چی بوو ئاخر

ئەم هەموو فرمێسکەت پێم ڕشت

تەنها ئەوە نەبێ شێتانە

دڵم بۆ خستیتە ناو مشت

دڵت منالّ بوو

بەشیری شیعر بۆم گەورە کردی

کەچی کە گەورە بوو

عەشقی من لای ئەو بابردی.





( **خەون** )

ئەمشەو لە خەوما

تۆ هاتیتە لام

خۆت کرد بە ژوورەکەما

بەبێ سەلام

وامزانی ڕاستە

لەخەو هەستاوم

شەرم دای گرتم

کە تۆم بینی لەبەرچاوم

هاتیتە سەر جێگاکەم

دەستت گرتم

کە ماچتکردم

یەکسەر مردم

بەیانی هەڵسام

زانیم خەون و خەیاڵە

تۆ بێی بە میوانی من

زۆر مەحاڵە زۆر مەحاڵە.

## ( بڕواناکەم لێك دابڕابین )

هەموو شوێنێکی ئێرە

پڕە لە یادگاری من و تۆ

ئێستا مەملەکەتی ئازارن

جێژوانەکانی گفتوگۆ

من لە هەموو شتێکی ئێرە

بۆنی هەناسەی تۆ ئەکەم

گەربڵێم بیرت ناکەم

لەگەڵ خۆما درۆ ئەکەم

کەبێ تۆیی مەستم دەکا

وادەزانم هەر خۆشت دەوێم

دەچمەوە کۆنە جێژوانێ

بەنامەێی دەڵێم وەرە لەوێم

بە خەیاڵی هاتنی تۆ

زۆر ڕۆژم وەها ئاوا کردووە

بیرم ئەچێتەوە بە قوربان

کە ئەو زەمانە بەسەر چووە

هێندە بەدڵ خۆشم ویستوی

بڕواناکەم لێک دابڕابین

قەت بڕوام نەبوو ڕۆژێ بێ

بڵێی من و تۆ بۆیەک نابین.





## ( کارت )

ئەم جەژنەش هەرچاوەڕێ بووم

کارتێکی تۆم بە دەست بگات

دڵت بەچەند ووشەیەک

پیرۆزبایی جەژنم لێ بکات

ئۆقرەم نەگرت

بێ کارتی تۆ جەژن کەم

کارتەکەی پارتم دەرهێنا

بە دزیەوە

بەروارەکەم سڕیەوە

ناوی دوو هەزار و حەوتم لێنا.

## ( دەریا )

دەریا لەوەتەی هەی

هەر من کەنارت بووم

لەچوار وەرزی سالاَ

هەرمن یارت بووم

ئێستا وەک جاران

شەپۆل نادەی بۆم

هەرچۆنێ بی

منیش وەک تۆم

منیش وەک تۆ

دەمێ ڕوونم دەمێ لێڵم

هێدی هێدی ئەرۆم و

تەمەن جێ دێڵم

منیش وەک تۆ

خەمی نەگریس دەمخواتەوە

هەر شەوەی خەیاڵی ژوانێک

دەرگای دڵم دەکاتەوە

دەریا تەمەن کورتە

مەهێڵە چیتر بە فیرۆ بڕوا

دڵێک هەرتۆی پەرستبێ

کە مرد چی بڵێ لەلای خوا؟





## ( جەژنی بێ تۆیی )

بۆ ئەم جەژنە وێنەیەکتم

لە سوچێکی ژورەکەمدا هەڵواسیوە

دڵم زۆر بێ ئارامە

چونکە جەژنی بێ تۆیی نەدیوە

تەنیام هێندەی تەنیایی

دڵ پرم هێندەی دڵی خەم

رانەهاتوم یەکەم جارمە

بەبێ چاوی تۆ جەژن کەم

بەخەیاڵ ئەگەرێمەوە

بۆ ئەیو جەژنانەی لەلام بوی

کە هاوخەم و هاودەردی

ژینی تاڵی دنیام بووی

بۆ ئەو جەژنانەی

کارتمان بۆیەک دەنوسی

بە جەژنە پیرۆزەیەک

حاڵی یەکترمان دەپرسی

بۆ ئەو جەژنانەی

بەیەکەوە دەچوینە دەر

لەسەر خواستی یەکتر

جلوبەرگمان دەکردەبەر

دەبێ چی بێ دەسەڵاتم

کە ئێستا دووری لێم

تەنها وێنەیەک شک دەبەم

کەمێ سەبوری بدا پێم

نازانم بۆ وام گوڵم

لە جەژنانا زۆر غەمگینم

بۆیە لەخوا دەپاڕێمەوە

جەژنێکی تر بێ تۆ نەبینم.





**(بۆنا پرسی)**

بۆچی خۆتم لێ وون دەکەی

ئەو هەستەی دڵت چی لێ هات

کە دەت ووت رەنگە بمرم

گەر رۆژێ نەیەمە لات

یا دەتووت توخوا

زوو زوو تەلەفۆنم بۆ بکە

مەهێڵە بێ تاقەت بم

لەگەڵما گفتوگۆ بکە

کە رۆژێ دیار نەبام

لەسەد کەست دەپرسی لە کوێیە

دەتووت توخوا کە بینیتان

بابێتە لام ئیشم پێیە

ئەی ئێستا کە بۆ ناپرسی

چی دەکەم و لەکوێم

ئێستا بۆ بێ تاقەت نابی

بە مانگیش لەگەڵتا نەدوێم ؟







## ( تاقیم کەوە )

هەوڵ مەدە

خۆشەویستم بیر بەیتەوە

هەوڵ مەدە

دڵمان لەیەک بکەیتەوە

دوو ماڵن لێیان گەرێ

با بۆیەک بژین

بابینە سمبوڵی

جوانترین ئەوین

خۆت ئەزانی من

تاکە هیوای ژینم

تەنها ئەوەیە گوڵم

رۆژی جارێ تۆ ببینم

لە خۆشەویستیت تاقیم کەوە

بزانە چۆنم بۆت

زۆر زۆر دڵنیابە

تۆم خۆشتر دەوێ لە خۆم

شتێ شک نابەم





خۆشەویستیمی پێ بچوێنم

تەنها جارێک تاقیم کەوە

دڵنیابە سەد لە سەد دێنم.

## ( شێتەگیان )

وێنەکانم بسوتێنە

هەروەک دڵمت سوتاندوە

من لە خۆشەویستی تۆ

تەنها خەمم هەڵبژاردووە

هێندەی تریش لەگەڵما

هەڵسوکەوتت شێتانە بێ

رۆژێ هەردێ دڵی وێڵت

لە دەوری من پەروانەبێ.







## ( برین )

باوەڕ ناکەم

بۆمن بیت

دەترسم ڕۆژێ

لەبەرچاوم ون بیت

دەترسم ببیتە خەمێ

قەت نەبڕێیتەوە

ببیتە برینێک

هەربکولێیتەوە هەر بکولێیتەوە.





## ( دەست هەڵگرە )

ئەی ئەو کەسەی

لە دڵما وەک ئاگری

لەم هەموو ئازاردانەم

بۆ دەست هەڵناگری

لە هەنیسک و گریانی من

چیت دەست ئەکەوێ

خوا ئەزانێ لەخۆم زیاتر

تۆم خۆش دەوێ.







### ( هەرخۆتی )

لەخۆت شیرینتر هەر خۆتی

هەرخۆتی لەخۆت جوانتر

گەر دوای تۆ دڵ بە کەس دەم

دڵم ببێتە پارچەیەک ئاگر

ئیتر بۆچی

دڵ پیسیم لێدەکەی

پێم دەڵێی بە نیازی

دڵ بە کچێکی تر ئەدەی.





### ( فێرمکە )

بڵێم چی

کە نەتوانم لە بیرت کەم

دەفێرم کە

بامنیش زویرت کەم

من دڵی خۆم ئەناسم

چەند خۆشەویستی تۆی تیایە

بۆیە دەڵێم دڵنیابە

بە مردنیش کۆتایی نایە.







**(بەڵێنی شاعیرانە)**

بەڵێن بێ

بەڵێنی شاعیرانی پڕ لە خەم

گەرنەم توانی رۆژێ

ئەڵقەی تۆ لە پەنجەم کەم

شەرت بێ

هەردە پەنجەکانم بقرتێنم

زمانم لاڵ بێ دوای تۆ

کەناوی خۆشەویستی بێنم.





**(بڵێ بمرە)**

زۆر دەترسم رۆژێ بێ

جلی بوکێنی لەبەرکەی

خۆشەویستی پ

.0اکی من

بە نارەوا لەدڵ دەرکەی

توخوا گوڵم

ئەم قسەیەم لەگوێ بگرە

**کە بڕیاری شوکردنت دا**

**سێ ڕۆژ پێشتر بڵێ بمرە.**

**( دواپەیام )**

**دواپەیامم بۆ تۆ گوڵم**

**ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە**

**هەڵقوڵاوی ناخی دڵێکن**

**بەبێ تۆ ئێستا وەک کەلاوەیە**

**لەو ڕۆژەوە خۆشم ویستوی**

**چی ئازاری بە منت داوە**

**هەموویانم هۆنیوەتەوە**

**بۆم کردووی بە هۆنراوە**





**ئەو هۆنراوانەی لە تۆ ناچن**

**لێم مەپرسە بۆ کێن و چین**

**یاسای ژیان وەهایە گوڵم**

**پەنجەکانی دەست وەک یەک نین**

**کۆپلە بە کۆپلە بیانکە ملوانکە**

**بەگەردنتەوە هەڵیان بواسە**

**لێم گەرێ بامن هەر نوقمی خەم بم**

**مەپرسە هەرگیز لای من چ باسە**

**ژیانێکی خۆش بۆ تۆ دەخوازم**

**هیوادارم بەختەوەر بی**

**لەناو کەژاوەی زێڕینا**

**خاوەنی باشترین هاوسەر بی**

**ژیانێکی خۆش بەرێ بکەیت**

**دوعا ئەکەم خەم نەیەتە ڕێت**

**هەتا لە ژیانا مابی**

**خوای میهرەبان ئاگای لێت بێت**

**وانەزانی کەوا دەڵێن**

**خۆشەویستیت کاڵ بۆتەوە**

**یا ئەو کورەی جاران نیم و**

**ئیتر تۆم لەبیر چۆتەوە**







سوێند بەوەی بروات پێیە

کەلای من تەنها خودایە

خۆشەویستیت هەتا مرن

بۆ خاکی دڵم ئالأیە

لێرە بەدواش وەکو جاران

تا بتوانم بۆت دەنوسم

بە خۆشەویستیی دەبەخشم

هەموو ژیان و چارەنوسم

هەر ئەو کورەم کە پێم ئەوتی

گەر خۆشەویستی تۆ نەبێ

لە هەموو خۆشی ژیان و

لە ژیان خۆیشی تۆبە بێت

وەکو جاران خۆشم دەوێی

بە خەیاڵ لەگەڵتا دەژیم

گەر بێ تۆی مەستی کردم

بۆ سەبوری دڵ تاوێ دەگریم

ئیتر شەوانە بەبێ نازی





لەگەڵ شیعرێک پرسە دەگرم

چاوەرێدەکەم تا شەوێ

لە خەمی بێ تۆیی دەمرم

بیرت نەچێت دڵیشم لاتە

بەلأم مەمدەوە بە هەر لای تۆش بێ

ئامادەم ئێستاش روحیشمت بەمێ

ئەگەر بزانم دڵت پێی خۆش بێ

ماڵئاوا ئەی ئەو کەسەی

بەهاری ژینت لێکردمە پایز

لە خۆشەویستست ماڵئاوا

لەو چاوانەی تۆ ماڵئاوا ئازیز.

.................................